زنجیرەی پەروەردەو بانگەواز [53]

ڕاڤەی فەرموودەی

# بَدَأَ الْإِسْلَامُ غَرِيبًا

لا إله إلا الله
محمد رسول الله



نوسینی
شیخ الإسلام ابن تیمیة

قال لي صاحب أراك غريبا

بين هذا الأنام دون خليل

قلت كلا، بل الأنام غريب

أنا في عـــالـــمي و هذه سبيلي

هاوەڵێکم پێی وتم دەتبینـم غەریبـی

لە نێـو ئەم خەڵکـەدا بێ هـاودەمی

وتم نەخێر؛ بەڵکو ئەو خەڵکە غەریبن

من لە جیهانی خۆمدام و ئەمەیە ڕێگەم

ناوی نامیلکە : بۆ هەموو ئافرەتێك کە بڕوای بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێت
نوسەر : أبو مسلم مجدي بن عبدالوهاب الأحمد
وەرگێڕ: دایکی سوننە
زنجیرە : زنجیرەی (٥) لە (زنجیرەی پەروەردە و بانگەواز) .
ژمارەی سپاردن : (٨٧٩) .
ساڵی چاپ : ١٤٣٢ ی کۆچی ـ ٢٠١١ .ی لە دایك بوون .
تیراژ : ١٠٠٠ دانە

**بنکەی بڵاوکردنەوە :**

**کتێبخانەی سوننە - سلێمانی .**

**کتێبخانەی ئیمان - سلێمانی**

**کتێبخانەی سیما - چەمچەماڵ .**

**کتێبخانەی زانستی بەسوود – کەلار**

**کتێبخانەی پێشین – هەولێر**

**کتێبخانەی هیوا – بنەسڵاوە**

---

**سەرپەرشتیاری چاپ و بڵاوکردنەوە :**

**ماڵپەڕی بەهەشت**

**www.ba8.org**

**٠٧٧٠١٥١٧٣٧٨**

**وتەی مامۆستای بەڕێزم (( مامۆستا عەدنان بارام )) دوای پێداچوونەوەی نامیلکەکە.**

بارك الله فيكم و جزاكم الله خيراً، اللهَ أسألُ أن يَمُنَّ عليك و يرزقك الإخلاص و السداد في القول و العمل، و أن يجعلني و إياكم من الغرباء .... آمين. تمت المراجعة في ...

١٣ / ٢ / ٢٠١١ المصادف ١ / ربيع الأول / ١٤٣٢ يوم الأثنين. كلار.

أبو سنة

عدنان بن بارام الكردي

## پێشەکی:

بەناوی خوای گەورە، سوپاس بۆ خودایەك کە هەمیشە بەنـدەکانی مننەت بار دەکات بـە چـاکەکانی، شـوکری دەکـەم لەسـەر نیعمـەتی ئیسلام، داوای لێ دەکەم لەسەری بمژێنێت و لەسەر (( لا إله إلا الله )) بم مرێنێت، دواتر:

خوێنەری خۆشەویست: ئەم نامیلکەیە حازر و ڕێکخراو بوو کە لە فەتواکانی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەوە وەرگـێڕاوە، جـوان بـوو، گـرنگ بوو، وورد و پوخت و پڕ زانـست بـوو، وتم وەریدەگێڕمـە سـەر زمـانی شـیرینی کـوردی بـەڵکو خـودا بیکاتـە دانـە تروسـکەیەك و لەگـەڵ تروسکەکانی تردا ببنە مەشخەڵێك بۆ موسوڵمانانی هاو زمانم، کە بە ڕاستی خۆشەویستن لە دڵـە پـڕ تاوانەکەمـدا، خۆشـم ئـەوێن بـەڵکو سەرەڕای خراپیم خودا لەبەر خۆشویستنی موسوڵمانان خۆشی بـوێم و لێم خۆشببێت..

جا خۆشەویستان: سەرەڕای کردنە کوردی، هەندێ کات وام زانیووە ڕوونکردنەوەی زیاتری ویستووە، بۆیە قسەی خۆمـم خستووەتە نێـو ئـەم هێمایەوە (( - ئارهـا - )) لەبـەر پاراسـتنی ئەمانـەتی زانـستی، هەروەها کورتەیەکم لەسەر ژیانی شـێخ کۆکردوەتـەوە و وەرگێـڕاوە لـە هەندێ سەرچاوەی چاپ کـراوی متمانـەوە بـۆ ئـەوەی خزمـەتی بکـەم

چونکه خۆشمدەویٚ هەرچەندە بەڕاستی پیاوی وەك شێخی ئیسلام بە بچوکێکی وەکو من ناتوانریٚ خزمەت بکریٚت..! هێناومە کە لە نامیلکەکەدا نەبووە.

هەوڵمداوە بەم کەم زانینەی خۆمەوە کارێك بکەم کە خوێنەر وا هەست نەکات وەرگێردراوە، بەڵکو وەك ئەوە وابێت کە کوردێك نووسیبێتی.. وە بۆ ڕاڤەی ئایەتەکان زیاتر پشتم بە تەفسیری ڕامان بەستووە لەگەڵ فسیری تردا...

داواکارم خوای پەروەردگار لێمانی وەربگرێت و لای خۆی ئەم کردەوە کەمەم بۆ زیاترکات بە رەحمی خۆی، لێم خۆش بێت و لە ئێوە و هەموو برا و خوشکە موسوڵمانەکانم خۆش بێت، جا ئەگەر چاکی و تەواویەك هەبوو لەم کارە بچوکەمدا ئەوە لە پەروەردگارمەوەیە، ئەگەریش خراپە و هەڵە و نوقسانیەك هەبوو ئەوە لە شەیتان و لەم نەفسە بەدکارەمەوەیە.

موحتاجی ڕەحمی خودا

بلال جلال آل حراو

٢٨ ی شەعبانی ١٤٢١ ی کۆچی

کوردستان/ کەلار

## پێشکەش:

بەتۆ..

ئەی بابەگیان.. دایەگیان.. کە هەمیشە دوعـا و نزاتـان باشـی و سەلامەتی منە لە ئافاتی ڕۆژگار.

ئەی مامۆستاکەم (مامۆستا عدنان بارام) کە فێرت کردم مانای «لا إله إلا الله» چیە و سەبرت گرت لەسەر نەزانین و نادانیەکانم.

ئەی هەموو ئەوانەی تەنها وشەیەکتان فێرکردووم لە ژیانمدا..

ئەی ئەوەی کە لە پەیام تێدەگەیت و قسەکان دەبیستیت و شوێنی باشترینی دەکەویت.

ئـەی لاوی خوێنگـەرم و بـەجۆش کـە لـە غـەریبانی سـەردەم دەکەیت...! و نامۆیی ئیسلام بە کاری جوان و گوفتـاری بـاش لـە نێـو خەڵکیدا دەگۆڕیت بۆ بالآیی و بەرزی...!!؟

## کورتەی ژیان نامەی شێخ:

ئەگەر ئومەتی ئیسلامی لەسەری هەموو سەدەیەکدا پێویستی بەتازە گەرێك هەبێت ، کە گیانێکی زیندووی بەبەردا بکات ، و دەرگا داخراوەکانی دڵی بکاتەوە ، خۆ شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە تازەگەری سەدەی حەوتەمی کۆچیە کە خودا بۆ ئەو سەدەیە ناردی .

جا شێخ ئیبن تەیمیە دەرگای ئیجتیهادی والآکرد ، وە هەموو کۆت و بەندەکانی بەستەڵەکی فکری و دۆگمایی چاولێکەری کوێرانەی - کە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ مابوویەوە- شکاند ، هەروەك چۆن هێرشی دەکردە سەر لارێیان و دەجەنگا لەگەڵ بیدعە و گومڕایی دا، کە بازاڕیان گەرم بوو ، وە جۆریشیان زۆر بوو بوو.

هەروەها بانگەوازی دەکرد بۆ بەپاکی یەکتاپەرستن ، و تێگەیشتنی بیروباوەڕ لە قورئان و سوننەتەوە هەر چۆن پێشینی پیاوچاکان لەسەری بوون، ڕێگری دەکرد لە پشتوێن توندکردن بۆ جگە لە ڕێگەی خودا، جا نابێت توندبکرێت بۆ قەبری پێغەمبەرﷺ، وە نابێت بۆ پیاوچاکانیش، جگە لەهەر سێ مزگەوتەکە نەبێت، بەجۆرێك کە بۆ مزگەوتەکانە نەك بۆ قەبر.

شێخ ئیبن تەیمیە فەلسەفەی لاڕێی ڕیسواکرد بە پوچەڵکردنەوەی هەموو ئەو بەڵگانەی کەلێوەی هاتووە، وە هەیبەتی ئینکارکەکان و لاڕێیەکانی لە گومڕایان و کرۆك گەران ( الباطنیة) شکاند.

وەجەختی کردەوە لە گرنگی چاکسازی کارداران و کاربەدەستان پێکەوە..!! وە بانگەوازی دەکرد بە شوورا وەکو هۆکارێك بۆ چاکسازی کۆمەڵایەتی و سیاسی...!! و کردیشی بە شتێکی گرنگی وەها کە کاربەدەستی وڵات هەرگیز بێ نیاز نابێت لێی..!! وە پێویست بوونی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپەی دوو پاتکردوە...![1]

---

(١) ( شيخ الأسلام احمد تقي الدين إبن تيمية، عقيدته – دعوته – جهاده، تاليف: احمد القطان و محمد طاهر الزين ، طبع دار الإمان و دار القمة ٢٠٠١).

## ناو و نەسەب و لە دایك بوونی(١):

ناوی أحمدی کوڕی عبدالحلیم کوڕی عبدالسلام کوڕی عبدالله کوڕی الخضر کوڕی محمد کوڕی الخضری کوڕی علی کوڕی عبدالله نەوەی تەیمیەی حیرانی یە.

لەبارەی نازناویەوە بە (ابن تیمیة) إبن نجار دەفەرمووێ: وا باسکراوە بۆمان کە باپیرە گەورەی شێخ ناوی محمد بووە دایکی پێی گوتراوە تەیمیە، خۆیشی بانگەوازکار بوو ئیتر نەسەبی بوو بە ( إبن تیمیة ) دواتریش هەر بەوەوە ناسرا.

لە ڕۆژی دووشەممە ١٠ی ربیعی یەکەمی سالّی (٦٦١ك) لە ناوچەی حیران لەسەر زەمینی شام لەدایك بووە، وە بە (شیخ الاسلام تقي الدین) ناسراوە، وە نازناوی ( أبي عباس) بووە.

---

(١) لێرەوە تا کۆتایی ژیاننامەکەیم لە: ( ترجمة موجزة لشیخ الإسلام ابن تیمیة، شرح عقیدة الواسطیة، تالیف: علامة محمد خلیل هراس ١٩١٦م – ١٩٧٥م، ضبط و إخراج الأحادیث: علوی السقاف ، طبع دار الهجرة للنشر و التوزیع، طبعة الأولى ١٩٩١). هوە وەرگرتووە – وەرگێڕ– .

## دەربارەی واتای شێخ الاسلام وتراوە:

باشترین ماناش ئەوەیە کە (شێخێکە کە لە گەنجی دا لە ئیسلامەتی دا بووە، وە بەمەش تاك و ناسراو بووە لەوانەی پێش خۆی، دەستکەوتی ئەوەی کە پەیمان پێدراوە لە نارەحەتی قیامەت پارێزراو دەبێت ، بەکورتی واتای ئەوەیە کە نازناوی (شیخ الاسلام) ی هەیە، دەیگێڕنەوە بۆ ئەوەی کە هەر بە گەنجی دەستی بە ئیسلامەوە بووە و زانا و پایەداری نێو هاوتەمەنانی بووە، بۆیە ئەم نازناوەی وەرگرتووە و بەوەش لە پێشینەکانی خۆی جیادەکرێتەوە کە ئەم نازناوە تایبەت کرابێت پێیەوە.

لەبارەی نازناویەوە وتراویشە: شێخ و پایەداری ئیسلام بووە لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاریدا، خۆی لە شەڕی تەمەنی لاوێتی پاراستووە بە فەزڵی خودا، وە لەسەر ڕێگای ڕاست و سوننەت بووە لە فەرز و نەوافل دا .

ئەم ناوەش لە لای پێشینی پیاو چاك بەکار هێنراوە، ئیمامی شافعی و ئیمامی أحمدی کوڕی حەنبەل و جگە لەوانیش بەکاریان هێناوە خودا لەهەموویان ڕازی بێت.

## خێزانەکەی:

خێزانەکەی ( آل تیمیة ) لە خێزانە ڕەسەنەکانی ناوچەی (حەڕان) بووە، بە زانست و دینداری بەناو بانگ بوون..

- باپیرەی (ئەبو بەرەکات ، مجدالدین) لەگەورە زانایانی مەزهەبی حەنبەلییەکان بووە، خاوەنی پەرتوکی (المنتقى من اخبار المصطفى)یە کە ئیمامی شەوکانی ڕاڤەی کردووە لە کیتابی (نیل الاوطار شرح منتقى الاخبار).

- باوکی: (شهاب الدین عبدالحلیم، أبوالمحاسن) پیاوانی کەڵەگەت و گەورە و شێخ و زانای زۆری پێگەیاندووە، دوای باوکی بەڕێزی، لەنێویشیاندا دوو کوڕەکەی خۆی (ابي العباس إبن تیمیة) و (ابي محمد).

- براکەی: ئەبو محمد، شرف الدین، فەقیهی مەزهەبی حەنبەلی بووە، وە تەواو شارەزا بووە تیایدا.

## مامۆستاکانی:

قوتابی یەکەی (إبن عبدالهادي) دەڵێت: ئەو مامۆستا و شێخانەی کە ئیبن تەیمیە لێیانەوە زانستی شەریعەت فێر بووە زیاتر لە دووسەد شێخ دەبن، لە ناویاندا:

١. شمس الدین، ئەبومحمد، عبدالرحمن بن القدامە المقدسی کۆچکردووی ساڵی ٦٨٢ك.

٢. امین الدین ابو الیمن عبدالصمد بن عساکر الدیمشقي الشافعي کۆچکردووی ٦٨٦ك.

## قوتابی یەکانی:

بە ڕاستی شێخ الاسلام قوتابخانەیەکی بەردەوامە تاوەکو ئێستاش، لەسەردەمی خۆیدا زانای زۆری پەروەردە کردووە، بە ڕاستی تاوەکو ئەمڕۆش قوتابی و زانای زۆر پەروەردە دەبێت لەو قوتابخانە ڕەسەنەی شێخ الاسلام.

## لە ناودارترین قوتابی یەکانی شێخ:

١. شمس الدین، ابن عبدالهادی کۆچکردوی ساڵی ٧٤٢ك.

٢. شمس الدین الذهبي (ئیمامی زەهەبی) کۆچکردوی ساڵی ٧٤٨ك

٣. شمس الدین، ابن قیم (ئیمامی ابن قیم الجوزی) کۆچکردوی ٧٥١ك.

٤. شمس الدین، ابن مفلح خاوەن کتێبی (الأداب الشرعية) کۆچکردوی ساڵی ٧٦٣ك.

٥.عیمادالدین ابن کپیر (ئیمامی ابن کثیر) خاوەن کتێبی (تفسیر ابن کثیر) کۆچکردوی ٧٧٤ك.

## مەزهەبی شێخ:

لەسەر مەزهەبی حەنبەلی پەروەردە بووە، بەڵام دوای پێگەیشتن و تێگەیشتنی لە ئاینی ئیسلام گەشتە ئەوەی کەوابێ وەکو ئیمامی زەهەبی دەیگێڕێتەوە بۆمان:

ئەو ئێستا بۆماوەی چەند ساڵێکە فەتواکانی بە پێی مەزهەبێکی دیاری کراو نییە، بەڵکو بە پێی وەستانی بەڵگەکانە لەسەر شتەکان، بە ڕاستی ڕێگای سوننەتی سەرخستووە بە پاکی، وە ڕێگای سەلەفی دەرخستووە، بەڵگەی وا دەهێنێتەوە و ڕوونکردنەوەی وا دەدات و پێشەکی وا دادەنێت کە کەم وێنەیە، لە پێشی خۆیشی شتی وا دەگمەنە کرابێت، وە زاراوەی وەها بەکار دەهێنێت کە کۆکراوەی یەکەمینەکان و کۆتاییەکان و ئەوانەشی دێن لە خۆ دەگرێت لە زانست و وتە سازی دا، هەر لەسەر ئەوەش ڕۆیشتووە.

## نوسراوەکانی شێخ:

ئیمامی زەهەبی لەبارەی نوسراوەکانی شێخەوە دەڵێت: (نوسراوەکانی شێخ الاسلامم کۆکردەوە خودا لێی ڕازی بێت، نزیکەی هەزار نوسراو دەبوو، دواتریش هەندێکی ترم دۆزییەوە.

هەروەها قوتابی سەنگین و بە ناوبانگی شێخ الاسلام (إبـن قـیم) کتێبێکـی نوسـیوەتەوە بـەناوی (اسمـاء مولفـات إبـن تیمیـة) کـە ناونیشانی هەموو نوسراوەکانی شیخ الاسلامی لە خۆ گرتووە.

هەروەها ناوازە بووە لە نوسین و پیت چـنین و وشـە سـازی دا، لـە زاراوەی پـڕ واتـا و هێـزدا، لـە دارشـتنەوەی وشـەکاندان لـە ڕوونـی نوسینەکانی دا، تەنانەت بە جۆرێك کە دوژمنەکەی (إبن الزملکاني) شایەتی ئەوەی بۆ داوە.

## سیفاتە زاتی و ئەخلاقییەکانی:

لە بارەی سیفاتی جەستەییەوە: ڕەنگی سپی پێست و قـژی ڕەش و ریشێکی ڕەشی هەبووە، تاڵی سپی کەم بووە، قژی تاوەکو لای نـەرمای گوێی درێژ بووە، چاوەکانی دوو زمان بوون و قسەیان دەکرد، پیـاوێکی چوار شانە بووە، ناوشانی پان بووە، دەنگی زوڵاڵ بووە، زمانی پاراو بووە، خوێندنەوەی خێرا بووە، بەڵام بە نەرمی دەیخوێندەوە.

## بەڵام لە بارەی هەڵسوکەوتیەوە:

بەڕاسـتی زۆر بـەڕێز بـووە، بەخـشندە بـوو، هەڵـسوکەوتەکانی ڕەنگدانەوەی سیفەتی خۆی بوو نەك دروسـتی بکـات و خـۆی واپیـشان بدات...! ئەو بەڕاستی چاو نەترس و بێباك بووە...!! دونیا نەویست بـوو،

هەرگیز پەیوەست نەدەبوو پێوەی..! زۆرێک لە شتە ڕێپێدراوەکانی (مباحات)ی واز لێ هێنابوو لە ترسی کەوتنە حەرامەوە...!!

## جیهاد و تێکۆشانی لە پێناو خوادا:

بە ڕاستی جیهادی کردووە بە دەم و زوبان و دەست و قەڵەمەکەی..! لە جەنگی دژ بە تەتارەکاندا بەشدار بووە، هانی موسوڵمانانی داوە لە دژیان..!! لە ڕیزەکانی پێشەوە بووە..!! لە ڕووداوی (شەقحەب)ی ساڵی (٧٠٢ك)، لە دژیان وەستا لە ڕۆژی ( مجر الصفر) ڕۆیشتە لای پاشای تەتارەکان (قازان) بە جۆرێک قسەی دەکرد کە ئامادەبوان واقیان ورمابوو...!!! تەواو سەرسامی شێردڵی و چاونەترسی شیخ الإسلام بووبوون...!! هەرچۆن بە توندی هۆشیاری دابوو بە سوڵتانی میسر لەسەر ئەوەی کە دەیویست میسر ڕادەستی تەتارەکان بکات...!!

## وتەی زانایان دەربارەی شیخ الإسلام:

یەکەم: زانای پایەدار إبن سید الناس ، خاوەن کتێبی ( عیون الاثر في المغازي ، الشمائل ، السیر ) کۆچ کردووی ساڵی ٧٣٤ك دەفەرموێت: (( والێی تێ گەیشتووم کە لە زانستەکاندا پشکی خۆی بردووە، ژمارەیەکی ئێجگار زۆری لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خودای ﷺ لەبەر کردووە، کاتێ قسەی لە تەفسیری قورئاندا دەکرد هەر خۆی تاڵا هەڵگری ئەو مەیدانەبوو، لەکاتی فەتوادانەدا هەر خۆی زانا و

شارەزابوو..! کە قسەی لە بارەی فەرموودەوە دەکرد هەرخۆی خاوەنی زانستی فەرموودە و ریوایەت و ڕەچەڵەکی فەرموودە بوو، ...... ، لە هەموو زانستەکاندا لە هاوتەمەنەکانی خۆی شارەزاتربوو، بەڕاستی هاوشێوەی ئەو بەرچاو نەکەوتووە، بەڵکو خۆیشی وێنەی خۆی نەدیتووە.

دووەم: کەڵە زانای ناودار شمس الدين الذهبي، خاوەن پەرتووکی ( سير أعلام النبلاء ) دەفەرموێت: ئەو زۆر گەورەترە لەوەی کەسێکی وەکو من قسە لە وەسفیدا بکات...!!! ئەگەر کرابا لە نێوان روکن و مەقامدا سوێندم بخواردایە، سوێندم دەخوارد کە من هەرگیز لە وێنەی ئەوم بەچاوی خۆم نەبینیوە، نەخێر ... بەخوا خودی خۆشی نمونەی خۆی نەبینیوە لە زانیندا...!!

سێیەم: زانای بەرێز السبكى، محمد بن عبدالبر الشافعى کۆچ کردووی ساڵی ٧٧٧ك دەفەرموێ: هیچ کەس ڕقی لە ئیبن تەیمیە نابیتەوە جگە لەوانەی نەزان و نەفام و ئارەزووپەرستن، چونکە نەزان نازانێت چی دەڵێت ، ئارەزوو پەرستیش ئارەزووبازی ڕێگرە لەبەردەم بینینی ڕاستی دا، دوای ئەوەی بۆشی دەردەکەوێت..!

چوارەم: زانای بەڕێز إبن دقيق العيد المالكى الشافعى کۆچ کردووی ٧٠٢ك دەفەرموێ: تا ئەو ئاستەی کە من تێکەڵ بووم لەگەڵ

نیبن تەیمیەدا، پیاوێك بوو كە هەموو زانستی لە پێش چاواندا بوو، ئەوەی دەویست لێی دەهێنا و ئەوەی نەویستایە بەلاوەی دەنا...!

پێنجەم: بەرز و زانا أبو الحجاج المزی الدمشقی الشافعی، خاوەن پەرتووكی ( تهذیب الكمال ) كۆچ كردووی ساڵی ٧٤٢ك لەبارەی شێخی ئیسلامەوە دەفەرموێ: لە شێوەیم نەبینیوە..! خودی خۆشی وەكو خۆی نەبینیوە..!! كەسێكم نەبینیووە زاناتربێت لە ئەو بە كتێبی خودا و سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ( قورئان و سوننەت) ، نەشم بینی كەسێك لەو زیاتر پابەندیان بێت..!!

شەشەم: إبن حجر الاسقلانی، خاوەن پەرتووكی ( فتح الباري شرح صحيح البخاري ) كۆچ كردووی ٨٥٢ك دەفەرموێ: لە هەمووی سەرسوڕهێنەر تر ئەوەیە كە ئەم پیاوە لە هەموو خەڵك زیاتری لەسەر ئەهلی بیدعەكان دەیگووت، هەر لە ڕافزیەكان و حلولیەكان و ئیتتیحادیەكان، نووسراوەكانی لەم بوارەدا ئێجگار زۆرە..! كە ناكرێت بخرێتە سنوری ژماردنەوە..!!

## پوچەڵ كردنەوەی درۆیەك لەسەر شێخ:

بەدڵنیاییەوە درۆگەلێكی زۆر دراوەتە پاڵ شێخی ئیسلامەوە لە لایەن دوژمنان و ڕق لە دڵانی سەردەمی خۆی... لەوانەی كە ئەهلی هەوا و ڕێگەی چەوتی بیدعەكاری بوون...! چ لە ژیانی خۆی دا، یان لە

دوای خۆشی تاوەکو ئەمرزمان هەر درۆی بۆ دەکرێت، بەڵام لە هەمووی سەیرتر ئەو درۆ زەبەلاحەی کە بیدعەکارانی ئیستاش هەر تەپڵی بۆ لێدەدەن...!! درۆکەی ( إبن بطوطة) یە - شایستەی چیە خودا پێی بکات - ، کە لە پەرتووکی ( رحلة إبن بطوطة) دا، بە ناو نیشانی ( تحفة الأنضار في غرائب الأمصار و عجائب الأسفار) هێناویەتی و دەڵێت: (لە ڕۆژی پێنج شەممەدا گەشتم، کە ڕۆژی نۆیەمی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز بور لە ساڵی ٧٦٢ك گەیشتمە شاری دیمەشق لە شام.... تا دەگاتە .... جا لە دیمەشق دا یەکێك لە گەورە زانایانی مەزهەبی حەمبەلی هەبور کە ناوی تقي الدين ابن تيمية بور، گەورەی شام بور، قسەی لە زانستە جۆراوجۆرەکاندا دەکرد، بەلاّم مێشکی شتێکی هەبور - گرفتی عەقڵی هەبور - ...!! وە خەڵکی دیمەشق زۆر بە گەورە و بە ڕێزەوە تەماشایان دەکرد، ئەویش لە سەر مینبەرەوە ئامۆژگاری دەکردن.... تا دەگاتە...... لە ڕۆژێکی هەینی دا کە منیش لەویّ ئامادە بووم، لەسەر مینبەری نوێژگەوە وتاری هەینی دەخوێندەوە، یادی دەخستنەوە، جا لە میانەی وتەکانیدا وتی:

خودا دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا هەروەك من چۆن دادەبەزم، خۆیشی لەسەر پلیکانەی مینبەرەکەوە دەهاتە خوارەوە، فەقیهێکی مالیکی کە بە ئیبن زەهرا ناسراو بوو، بەرپەرچی دایەوە و نکۆڵی

لێکرد ، ئەوەی ئیبن تەیمیە روتی ڕەدی کردەوە، ئیتر خەڵکیش هەستانەوە بۆ ئەم فەقیهـە و بـە دەسـت و بـە نـەعال ئەوەنـدەیان لێـدا تـاوەکو مێزەرەکەی سەری کەوت..! ..... تا کۆتای درۆ و دەلەسەکەی...!

جا ئەمە قسەکەی بور...! ئەمە دەلەسەکەی بـوو...!! بـەلاّم شـێخ أحمد إبراهیم لە کتێبی ( شرح قصیدة النونیة ) دا دەڵێت:

پەنا بەخوا لەم درۆیە، کە درۆزنەکەی لـە خـوا نەترسـاوە، درۆ و دەلەسـەکەی زۆر بـێ شـەرمانەیە، هـەر ئەوەیـە کـە فەرمایـشتی پێغەمبەری خـودا ﷺ دەفـەرموێت: " إذا لم تستحي، فاصنع ما شئت ". واتە: ئەگەر شەرمت نەکرد ، هەرچیت ویست بیکـە. بـەو واتایەی کە مرۆڤی بێ شەرم هەموو شتێکی لێ دەوەشـێتەوە..! چـونکە ڕونکردنەوەی ئەم درۆیە وەك ڕوونی مانگی چواردەی شەوانە، کە ئاسانە دەریبخەین..! لەبەر ئەوەی إبن بطوطة دەڵێت: من لـە ٩ ی ڕەمـەزانی ساڵی ٧٢٦ك چوومە دیمەشقەوە، بەڵام شێخی ئسلام ئـیبن تەیمیـە لـەو کاتەدا زیندانی کرابوو لە قەڵای دیمەشق..! هـەر چـۆن زانـا بـاوەڕ پـێ کراوەکان بۆمان دەگێڕنەوە، وەکو قوتابیەکەی خـۆی ( الحافظ محمد بن احمد بن عبدالهادي) و ( الحافظ أبي الفرج عبدالرحمن بن أحمد بن رجب: لە کتێبی طبقات الحنابلة ) لە پێناسـەی شـێخی ئیسلامدا دەڵێت: شێخی ئیسلام لـە قـەڵای دیمەشـق دەسـت بەسـەر و

زیندانی کرابوو لە مانگی شەعبانی ساڵی ٧٢٦ك ، تاوەکو مانگی ذي العقدة ی ساڵی ٧٢٨ ك ). واتە پێش ئەوەی ئەم درۆزنە بگاتە دیمەشق ئەو زیندانی کرابوو...!!

هەروەها إبن عبدالهادي ئەوەشی زیاد کردووە کە لە شەشەم رۆژی مانگی شەعباندا زیندانی کراوە. جا تەماشای ئەم درۆزنە (إبن بطوطة) بکە...!؟ وا باس دەکات کە لەو کاتەی ئەم چووەتە نوێژگە، ئەو لەسەر مینبەرەکە بووە..! ئەی هاوار بە ماڵم...! تۆ بڵێی مینبەرەکە گوێزرابێتەوە بۆ قەڵای دیمەشق...!؟

بەهەر حاڵ شێخی ئیسلام – رحمه الله – ئەو کاتەی کە خرایە زیندانی قەڵاوە لەو بەروارەی کە باسکرا ، دەرنەکرا و ئازاد نەکرا تاوەکو بە تابووتەوە هێنرایە دەرەوە...! خودا قەبی پڕ نوور بکات.

هەروەها ئیمامی حافظ عماد الدين بن كثير لە پەرتووکی (( التاريخ )) دا هەر بەم شێوەیە باسی کردووە. ئەوەی مەبەست بوو گەشت.

## ئازارەکانی و کۆچی دوای:

دژایەتی کەرانی دەستی باڵایان لە ئازار دان و دۆسیە تاڵەکانی شێخی ئیسلام دا هەبوو، ئەوانەی کە شێخ پێچەوانەی بیر و ڕا و فەتوایان قسەی دەکرد ، لە ئەهلی کەلام و صۆفیەکانی سەردەمی خۆی.

**چەندین جار زیندانی کراوە، لەوانە:**

**١. ساڵی ٧٠٥ك لە ڕۆژی هەینی دا لـە ٢٦ ی ڕەمـەزان. وە شـەوی جەژنی هەمان ڕەمەزاندا گواسترایەوە بـۆ شـوێنێکی تـر لـە ناوچـەی ( جوب ). لەوێ دا بۆ ماوەی ساڵێکی ڕەبەق مایەوە، دواتر ئازاد کرا.**

**٢. لە ڕۆژی ٢٣ ی ڕەبیعی یەکـەمی ٧٠٧ك جـارێکی تـر دەسـتگیر کرایەوە لەبەر قسە هەڵبەستراوەکانی صۆفیەکان، لە سـاڵی ٧٠٩ك لـە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا ئازاد کرا.**

**٣. ساڵی ٧٢٦ك دەستگیر کرایەوە و فەتوای لێ قەدەغە کـرا و لـە ١٠ ی شەعبانی هەمان ساڵ ڕاپێچ کـرا ، بـۆ مـاوەی سـاڵێك و یـەك مانگ لە زینداندا مایەوە، وە هەر لەم زیندانەدا لە شەوی دوو شەممەدا بەرامبەر بە ١٠ ی ذي العقدة ی ساڵی ٧٢٨ك کۆچی دوای کرد.**

**جا خەڵکێکی بێ شـومار لەسـەر تەرمەکـەی ئامـادەی ناشـتنی بوون، بە شێوەیەك کە لە ژماردن نـەدەهاتن...! کـە ئەمـەش وتەکـەی پێشەوای ئەهلی سوننەت ڕوون دەکاتـەوە ، ئیمـامی ئەحمـەدی کـوڕی حەنبەل ، کە فەرموی: (( قولوا لأهل البدع: بيننا و بينكم شهود الجنائز )).**

**بەڵێ...! ئا بەو شێوەیە کۆچی دوای کرد...!؟ دوای ژیانێکی پڕ لـە بانگـەواز و جیهـاد و وانـە و فـەتوا و نووسـین و ڕوویـەڕوو بوونـەوە و**

موناقەشە و مونازەڕە و پشتیوانی کردن لە ڕێبازی سەلەفی ساڵح ، هاوسەرگیری نەکردبوو، وچانی نەدەدا، ماڵ و موڵکی لە دوای خۆی بەجێ نەهێشت...!!؟

ڕەحمەت و بەرەکەتی خودا بەسەر شێخی ئیسلامدا ببارێت، بە فراوانی ڕەحمەتی خوای گەورە، خودا لە فراوانیەکانی بە هەشتی بەرین دا ئاسودەی بکات، پاداشتی زۆری بداتەوە لەسەرمان و لەسەر هەموو ئومەتی ئیسلام بە باشترین و چاکترین پاداشت.

آمين يا رب العالمين.

و صلى اللهم و سلم على نبينا محمد و على اليه و صحبه و سلم.

# بَدَأَ الْإِسْلَامُ غَرِيبًا

**شێخی ئیسلام ( ئیبن تەیمیە) فەرمووی:**

## لێکدانەوەیەك[1]

بۆ وتەی پەیامبەر ﷺ، کە لە فەرمودەیەکی صحیح دا دەفەرموێت:" بَدَأَ الْإِسْلَامُ غَرِيبًا، وَسَيَعُودُ غَرِيبًا كَمَا بَدَأَ ، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ"[2]

واتە: ئیسلام بەنامۆی سەری هەڵدا، وە دووبارە نامۆ دەبێتەوە وەکو سەرەتا، جا سەرفرازی بۆ نامۆیان.

بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کاتێ کە نامۆ بوو ئیتر بۆمان هەیە وازی لێبهێنین ...! - پەنا بەخوا- بەڵکو کارەکە بەو جۆرەیە کە خودا دەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾ (ال عمران ٨٥)

---

[1] ( مجموع الفتاوى ١٨/٢٩١-٣٠٥ ).

[2] ( فەرموودەیەکی صحیحە:ئیمامی موسلیم ١٤٥، ئیمامی ئیبن ماجە ٣٩٨٦، ئیمامی ئەحمەد ٨٨١٢ ، لە فەرموودەی ئەبو هورەیرەوە گێڕاویانەتەوە).

واتە: هەرکەسێك بێجگە لە بەرنامە و شەریعەتی ئیسلام هەر دینێك بۆخۆی هەڵبژێرێت و بیکا بە بەرنامەی خۆی، ئەوا هەرگیز لێی وەرناگیرێت، و لە پاشە رۆژدا لە خەساروت مەندان دەبێت.

وە دەفەرمویت: ﴿ إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ﴾.(ال عمران ١٩)

واتە: بێگومان دینی پەسەند و قبولّ لای خوا تەنها ئیسلامە.

وە کە دەفەرمویت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ﴾ (ال عمران ١٠٢)

واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕ دەبێ هەرچۆنێك پێویستە ئەوا لە سنورەکانی خودا پارێز بکەن.. هەمیشە گوێڕایەلّ بن، هەرگیز سەرپێچی نەکەن، هەردەم خوداتان لەیادبێت، هیچ کاتێك لەبیری نەکەن، سوپاسگوزار بن، سپلە مەبن، وە دەبێ هەر بە موسولّمانێتی بمرن - هەتا زیندوون توند دەست بە ئیسلامەکەتانەوە بگرن ، دەستی لێ بەرمەدەن، هەتا ڕۆژێ کە مردن با بەدینەوە بچنەوە لای خودا-.

وە ئەوەش کە دەفەرمویت: ﴿ وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلاَّ مَن سَفِهَ نَفْسَهُ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلاَ تَمُوتُنَّ إَلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾ (البقرة: ١٣٠ - ١٣٢)

واته: كێ هەیە بەدەر لەوكەسە خۆی گێل و گەوج بكا، ئاینی ئیبراهیم بنێتە لاوە و لێی لابدات ، و دەست بداتە بت پەرستی، بێ گومان ، ئێمە لەم دونیایەدا ئیبراهیممان هەڵبژارد و پایەی پەیامبەرێتی مان پێبەخشی، وە لەدوا ڕۆژیشدا وا لەڕیزی چاكان و صالحاندا، ئەوەدەمە كە پەروەردگاری هەڵیبژارد و پێ ی فەرموو: دەبێ ملكەچی بڕیار و فەرمانی من بی و خۆت تەسلیمی ئێمە بكەیت، ئەوجا ئەویش گوتی: وا خۆمم تەسلیم و ملكەچی فەرمانەكانی خودادەكەم ، و تەنها ڕوو لەو دەكەم، ئیبراهیم و یەعقوب، ئەو ئاینەیان بەكوڕەكانیان وەسێت كرد و ڕاسپارد، گووتیان: ڕۆڵەكانم ..! بێگومان بن كە خودا ئەم ئاینە یەكتاپەرستیەی هەڵبژاردووە بۆتان، دەسا ئێوەیش هەوڵ بدەن كە تەنها و تەنها بەموسڵمانێتی بمرن .

لەشوێنەكانی تردا زیاتر لەسەر ئەم بابەتە ڕۆشتوین و ئەوەشمان ئاشكرا كردووە كە ئاینی هەموو پێغەمبەران ئیسلام بووە، هەر لە پێغەمبەر نوح علیه سلام تاوەكو مەسیح علیه سلام، جا ئەو وەختەی كە ئاینی ئیسلام بەغەریبی و نامۆی سەری هەڵدا هیچ لە ئاینەكانی تر وەرگیراو نەبوو، بەڵكو چەسپاوە لەفەرموودەیەكی صحیح دا لە(عیاض بن حمار) لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرمویەتی:

" إن الله نظر إلى أهل الأرض فَمَقَتَهُم – عربهم وعجمهم– إلا بقايا

من أهل الكتاب " الحـــديث.[1] واتــە: بێگومــان خـودا تەماشــای خەڵكی سەر زەوی كرد، جا ڕقی لێیان بۆوە – عەرەب و عەجـەمیان –، مەگەر هەندێ نەبێت كە مابوون لە ئەهلی كیتاب.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت كە ئەگەر نـامۆ بـوو ئـەوا ئـیتر ئەوانـە دەستیان پێوە گرتووە لە چارە ڕەشی و شەڕدان، نا... بەڵكو سەرفرازترین خەڵكن هەرچۆن لەكۆتای فەرموودەكەدا فەرموی (فطوبى للغرباء)وە وشەی ( طوبى ) لە خۆشی و چاكیەوە هاتووە – سەرفرازی –.

خودا دەفەرموێت: ﴿ طُوبَى لَهُمْ وَحُسْنُ مَآبٍ ﴾ (الرعد : ٢٩ )

واتە: ژیانیان خۆش دەبێت، گەڕانەوەیەكی خۆش و چاك.

– ئەوەش لەبەر نزیكیان لەڕەزامەندی خوداوە لە دونیـا و دوا ڕۆژدا، وە تەواوی ئاسودەیی و ئارامیان هەیە، وە لـە نێـو ئـەو بەخشـشانەشدا داری ( طوبى) كە ئەگەر سوارچاكێك سەد ساڵ بەژێر سێبەرەكەیدا بـڕوات نایبڕێـت [1]

---

(١) .(فەرموودەیەكی صحیحە: ئیمامی موسلیم ٢٨٦٥، ئیمامی ئەحمەد ١٧٠٣٠، لە فەرموودەی عیاض ی كوڕی حیمارەوە گێڕاویانەتەوە).

[1] (تيسير الكريم الرحمن في تفسير القران).

هەرچۆن لە واتای (طوبى)[1] لە کتێبی (تفسیر القرآن العظیم)ی ئیبن کەسیردا هاتوە... "وقد قال عبد الله بن وهب: حدثنا عمرو بن الحارث، أن درَّاجا أبا السَّمْح حدثه، عن أبي الهيثم، عن أبي سعيد الخدري، رضي الله عنه، [مرفوعا: "طوبى: شجرة في الجنة مسيرة مائة سنة، ثياب أهل الجنة تخرج من أكمامها" (٢)

واتە: عبد الله ی کوڕی وهب وتی، عەمری کوڕی (الحارث) پێی وتین، کە دەرراج (أبا السَّمْح) پێی گوتوە،لە (أبي الهيثم) ەوە،لە (أبي سعيد الخدري) ەوە بە مەرفوعی: (طوبى) دارێکە لە بەهەشتدا کە رێگای سەد ساڵ گەورەیە، جلوبەرگی خەڵکی بەهەشت لەبەری ئەو دارەیە.

---

[1] لە زیاد کردنەکانی وەرگێڕ بۆ زیاتر روون کردنەوەی واتای (طوبى).

(٢) (ئیمامی احمد ٧١/٣ و ئیمامی ابو یەعلا ١٣٧٤ و ئیمامی ابن حبان ٧٤١٣ و ئیمامی الخطیب ٩١/٤ و ئیمامی الطبری ٢٠٣٩٤ گێراویانەتەوە، وە ڕەچەڵکی لاوازە_ اسنادە ضعیف_، لەبەر لاوازی دراجّ لەکاتی گێرانەوەی لە ابی هیثم، بەڵام بۆ سەرەتاکەی شایەتی تر هەیە کە بەهێزی دەکات، وە ترس تەنها لەبەشی دووەمیەتی :(ثیاب اهل الجنة تخرج من اکمامها ).

وە لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە: "عن إسحاق بن راهويه، عن مغيرة المخزومي، عن وَهيب، عن أبي حازم، عن سهل بن سعد قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: "إن في الجنة شجرة يسير الراكب في ظلها مائة عام لا يقطعها" قال: فحدثت به النعمان بن أبي عياش الزّرَقي، فقال: حدثني أبو سعيد الخُدْري، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: "إن في الجنة شجرة يسير الراكب الجَوَاد المضمَّرَ السريع مائة عام ما يقطعها".[1]

واتە: بێگومان دارێك هەیە لە بەهەشتدا ئەگەر سوارچاكێك سەد ساڵ بەژێر سێبەرەكەیدا بڕوات نایبڕێت، وتی: ئەمەم وتە ( نوعمان ) ی كوڕی (ئەبی عەیاش) ی زەرەقی، جا وتی: أبو سەعیدی خودری پێی وتم، لە پێغەمبەری خواوە كە فەرموویەتی: بێگومان دارێك هەیە لە بەهەشتدا كە ئەگەر سوار چاكێكی تەمام لێزانی خێرا بە سەد ساڵ بەژێر سێبەرەكەیدا بڕوات نایبڕێت - .[1]

---

[1] (ئیمامی بوخاری:٦٥٥٢ وە ٦٥٥٣، وە ئیمامی موسلیم ٢٨٢٧ وە ٢٨٢٨) گێڕاویانەتەوە.

[1] زیادكراوەكانی وەرگێڕ تەواوبوو.

جا ئەم كاتەش هەروەك جۆری ئەوانـەی پێـشوو دەبێـت، ئەوانـەی كەشوێنی كەوتن لەكاتێكدا كە نـامۆبوو، وە خـۆش بـەختترین خـەڵك بوون، وە سەرەڕای ئەوەش لە دوا ڕۆژدا بەڕێزترین و بەرزترینی خـەڵكن دوای پەیامبەرانی خودا عليهم السلام.

وە سەبارەت بە دونیایان، خودا دەربارەیان دەفـەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللَّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ (الأنفال : ٦٤ )

واتە: ئەی پەیامبەر تۆ هەر خوات بەسە بۆ چاودێری و پاراستنت، وە بۆ ئەو بڕوادارانەش كە پەیڕەوت لێ دەكەن هەر خودا بەسە.

وە پەروەردگاری بەرزوو بڵند دەفـەرموێت: ﴿ إِنَّ وَلِيِّيَ اللَّهُ الَّـذِي نَزَّلَ الْكِتَابَ وَهُوَ يَتَوَلَّى الصَّالِحِينَ ﴾ ( الأعراف : ١٩٦ )

واتە: بەڕاستی گەورەو سەرپەرشتیاری من هـەر خوایـە كـە ئـەم قورئانەی ناردۆتە خوارەوە، وە هەر بۆ خۆیشی چـاودێری و سەرپەرشـتی صاڵحان و چاكان دەكات.

وە فەرمویەتی: ﴿ أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ ﴾ ( الزمر : ٣٦ )

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئایا هەر خوا بەس نیە بۆ بەندەی خۆی؟

هـەروەها: ﴿ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا (٢) وَيَرْزُقْهُ مِـنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَن يَتَوَكَّلْ على اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ﴾( الطلاق : ٢، ٣ )

واتە: وە هەرکەسێك لە خودا بترسێت و سنورەکانی بپارێزیت خودا دەرووی خێـری لـێ دەکاتـەوە(٢) ڕزق و ڕۆزی دەداتـێ لەشـوێنێکەوە کەخۆیشی گومـانی نـەدەبرد - ڕێنمـوونی دۆزینـەوەی ڕێگـای ژیـانی دەکات-، وە هەرکەسـێك پـشت بـەخوا ببەسـتێت دوای بـەکارهێنانی هۆکار، ئەوە تەنها خوای بەسەو کاروباری بۆ ئاسـان دەکـات، چـونکە بێگومـان هەرچی خـوا بڕیـاری لەسـەر هـەبێت ئـەوا ئـەنجامی دەداو دەیگەیەنێتە جێ (٣).

جا موسوڵمانی شوێن کـەوتووی پێغەمبـەر ﷺ، خـوای گـەورەی هەیە و ئـەوی بەسـە، وە هەرئەویـشە کـە دۆسـت و پـشتیوانێتی لـە هەرکوێ بێ و لەهەر کات بێت.

هەرلەبـەر ئەمەشـە کـە موسـوڵمانانی پەیوەسـت بـە ئیـسلام دەبینیت بـەپێی زیـاتر پەیوەسـت بونیـان بەئیـسلامەوە لـە وڵاتـانی کافریشدا هەر خۆشحاڵن . وە ئەگەر شـەڕێکیان تـووش بێـت ئـەوا بـەهۆی تاوانی خۆیانەوەیە، بەجۆرێك تەنانەت مووشـریکەکان و ئـەهلی کیتابـەکان ئەگەر موسوڵمانێکی پەیوەیست بە ئیسلامەوە ببینن بـە گـەورەی دەزانـن و ڕێزی لێ دەگـرن و ئـەوەی لەگـەڵ موسـوڵمانی بـێ کـردەوە و بـە حیـساب موسوڵماندا دەیکەن ئەوی لێ دەپـارێزن و ئـەو ڕەفتـارەی لەگـەڵ ناکـەن و ئەوەش کە کار بە ئیسلام ناکات ڕێز و قەدری نیە لایان.

هەرواش موسوڵمانانی سەردەمی یەکەم کەئیسلام سەری هەڵدا، وە لەهەموو کاتێکیشدا هەروایە، جا ئەوە هەر دەبێت کە خەڵکی لەم دوونیایەدا توشی شەڕ و ناهەمواری بن، ئەوەش بزانە کە بەخششەکانی خوای گەورە زیاترە لە ناهەمواریەکانی، بەڵام ئەوەی تیایە کە ئەو شەڕ و ناهەمواریەی توشی موسوڵمان دەبێت کەمترە لەو بەخششە زۆرانەی کە خوای گەورە پێی داوە، وە هەرواش بوو بۆ موسوڵمانانی سەردەمی یەکەمی ئیسلام، کە توشی هەموو جۆرە ناڕەحەتیەك بوون هەر لە دەربەدەری و کوشتن و بڕین بەدەست کافرەکانەوە، بەڵام ئەوەی کە توشی کافرەکان هات لە ڕوو زەردی و زەلیلی و بەهیلاك چون زۆر زیاتر بوو وەك لەوەی کە موسوڵمانان توشیان بوو بوو، وەئەگەر کافران سەرەتا ڕیز و گەورەیی و سەروەت و سامانی زۆریان لەدەستا بوو، ئەوا ئەوەی موسوڵمانان دەستیان کەوت زۆر زیاتر بوو تەنانەت لە خەڵکی تریش زیاتر.

جا پێغەمبەری خودا ﷺ لەوکاتەی کە موشریکەکان هەوڵیان دەدا بەهەموو ڕێگایەك ئازاری بدەن - خودا- لەگەڵیدا بوو، وە پشتیوانی دەکرد و ڕێگەی لە دوژمنان دەگرت و سەری بەرزدەکردەوە و دەی پاراست و سەریشی خست، ئەمە لەکاتێکدا کە سەردارانی قورەیش تیایاندا نەبوو ئیلا دەستی لە ئازاردانی پێغەمبەری خوادا ﷺدا هەبوو، دەستی لە سوکایەتی و ناڕەحەت کردنیدا هەبوو، بەڵام بۆ

هەموو زاڵمێك زەواڵێك هەیە کە بەرامبەری بگرێت و دەستی بشکێنێ و دژایەتی بکات، هەر ئەوەشە حاڵی کەسانێکە کە شوێنی ئیسلام ناکەون، هەندێکیان لە هەندێکی تریان دەترسن و ئەمیان کڕنوشی ترس و زەلیلی بۆ ئەوی تر دەبات.

جا شوێنکەوتوانی، ئەوانەی کە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، شای حەبەشە ڕێزی لێ گرتن و گەورەی ڕاگرتن تا لوتکەی ڕێز و گەورەیی، وە ئەوانەی کە کۆچیان کرد بۆمەدینە بەهەمان شێوە ڕێزدارتر و بەقەدر تر بوون.

وە ئەو ئازارەی کە لە دورنیا توشیان دەبوو خێرا پەندیان لێوەردەگرت و تام و چێژی ئیمانیان زیاتر وەردەگرت لەو ئازارانەی کە توشیان دەبوو، هەرچۆن دوژمنەکانیان ئازار و ناڕەحەتی زیاتریان دەچەشت و نە بە زووی و نەلە دواجاردا پاداشتیشیان نەبوو، بەڵکو سزاش دەدرێن بەهۆی کردەوە چەپەڵەکانیانەوە.

لەکاتێکدا کە ئیمانداران بەو ئازارانە تاقی دەکرانەوە بۆ پاکژکدنەوەی ئیمانیان و سڕینەوەی تاوان و گوناهەکانیان، ئەمەش چونکە ئیماندار تەنها بۆخودا کار دەکات، وە ئەگەر ماڵێکی بەخشی ئەوا دەبێ تەنها لەبەر خوا بێت، ئەگەر وابوو ئەوا تەنها داوای پاداشتەکەی لەخوا دەکات.

ئیمانیش تام و چێژی تایبەتی خۆی هەیە لەدلاٌندا هـەرگیز هـیچ شتێك نایگاتیٚ، بۆیە پەیامبەر ﷺ دەفەرموێت : " ثلاث من كن فيه وجد بهن حلاوة الإيمان : من كان الله ورسوله أحـب إليـه ممـا سواهما، ومن كان يحب المرء لا يحبه إلا لله، ومن كـان يكـره أن يرجع في الكفر بعد إذ أنقذه الله منه كما يكره أن يلقي في النار "[1]

واتە: سیٚ شت هەن، هەرکەس ئەم سیٚ شـتەی تیٚـدا بیٚـت تـام و چێژی ئیمانی چەشتووە، هەرکەس خـودا و پێغەمبەرەکـەی ﷺ بـەلاوە خۆشەویستر بێت لە جگە لەوان، وە کەسـێك کەسـێکی خـۆش دەوێـت تەنها لەبەر خوا خۆشـی دەوێـت، وە کەسـێك کـە پێـی نـاخۆش بێـت بگەڕێتەوە بۆ ناو کوفر دوای ئەوەی خودا ڕزگاری کـرد، بـەجۆرێك کـە چۆن پێی ناخۆشە بخرێتە نێو ئاگرەوە.

وە لە صحیحی موسـلیمدا: " ذاق طعم الإيمان من رضي بـالله ربا، وبالإسلام دينًا، وبمحمد نبيًا "[1]

---

[1] (ئیمامی بوخاری ١٦ ، وە ئیمامی موسلیم ٤٣ لە فەرموودەی انس ی کوڕی مالیکەوە گێڕاویانەتەوە).

[1] (ئیمـامی موسـلیم ٣٤، وە ئیمـامی ترمـزی ٢٦٢٣ ، وە ئیمـامی احمـد ١٧٨١، لـە فەرموودەی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب)ەوە گێڕاویانەتەوە.

واتە: تامی ئیمانی چەشتووە ئەو کەسەی کە ڕازی بوو کە ( الله ) پەروەردگاری بێت، وە ئیسلام ئاینی بێت، وە محمد ﷺ پەیامبەری بێت.

هەرچۆن خوای گەورە ڕێگەی نەداوە - نەهی کردووە - کە پەیامبەرەکەی ﷺ توشی دڵتەنگی و ناڕەتی بێت لەبەر ئەوەی کەسانێك ناهێنە نێو ئیسلامەوە، هەروەشە بۆ ئەوانەی پاش پێغەمبەریش ﷺ دێن، جا ئیماندار نەهی لێکراوە دڵی بۆیان تەنگ بێت و خۆی ناڕەحەت بکات لە فرت و فێڵیان.

بۆیە دەبینیت هەندێ موسوڵمان کاتێ دەبینێ هەندێ شتی ئیسلام یان زۆرێکی گۆڕاوە، تێکدەچن و ناڕەحەت و بێزار دەبن، ئەنالێنن هەرچۆن توشبوان دەنالێن، کە بەڕاستی ئەوە نەهی لێکراوە، بەڵکو فەرمانی پێکراوە کە بە سەبر و ئارامگری و پشت بەستن و دامەزراوی لەسەر ئاینی ئیسلام، وە فەرمانی پێکراوە لەگەڵ لەخوا ناساندا بێت ئەوانەی کە چاکەکارن، وە بزانن کە سەرەنجام بۆ لەخوا ترسانە، ئەوەشی توشیان بووە بەهۆی گوناهی خۆیانەوە بووە، جا دەبێ ئارام بگرن چونکە بەڵێنی خوا ڕاستە، وە داوای لێخۆشبوون بکەن لەتاوانەکانتان، وە زیکری خوا بکەن لە شەوان و ڕۆژانیان.

وە فەرمایشتی : " وَسَيَعُودُ غَرِيبًا كَمَا بَدَأَ "واتە: دواتر نامۆ - غەریب - دەبێتەوە وەك چۆن سەرەتا وا دەستی پێ کرد.

**ئەمەش بە دوو جۆر دەبێت:**

یەکەمیان: لەهەندێ شوێن یان هەندێ کات نامۆ دەبێت و دواتر سەرلەنوێ بڵند و ئاشکرا دەبێتەوە، هەرچۆن لەسەرەتادا نامۆبوو، دواتر دەرکەوت، هەربۆیە فەرموی (وَسَيَعُودُ غَرِيبًا كَمَا بَدَأَ) واتە: (وە غەریب دەبێتەوە وەك سەرەتای دەست پێ کردنی) .

ئیسلام لە کاتی سەرهەڵدانی دا نامۆ بوو، نەدەناسرا، بەڵام دواتر دەرکەوت و ناسرا، بەو شێوەیەی یەکەم جاری لێدێتەوە کە نا ناسرێتەوە و پاشان دەردەکەوێت و دەناسرێتەوە، جا ئەو کەسانەی لەکاتی نامۆیدا دەیناسن وەکو ئەوانەن کەلەکاتی یەکەمدا دەیانناسی.

دووەمیان: ئەوەش هەڵدەگرێت کە لە کۆتا زەماندا موسوڵمان نامێنێت مەگەر کەمێك، ئەمەش دوای دەرکەوتنی دەججال و یاجوج و ماجوج دەبێت لەنزیك کۆتایی دونیا و هاتنی قیامەتدا، ئەو کاتە خودا بایەك هەڵدەکات کە گیانی هەموو ئیمانداران دەکێشێت و دواتر قیامەت هەڵدەسێت.

وە ئەمما پێش ئەوە پەیامبەر ﷺ فەرموی: "لا تزال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق، لا يضرهم من خالفهم، ولا من خذلهم حتى تقوم الساعة"[1]

واتە: بە بەردەوامی کۆمەڵێك لە ئومەتی من دیار و ئاشکران و لەسەر حەقن، وە سەرپێچی کارانیان و لەناوبەرانیان زیانیان پێ ناگەیەنن هەتاوەکو قیامەت هەڵدەسێت.

ئەم فەرموودەیەش لە هەردوو صحیحی بخاری و مسلم هاتوە، وە لەڕێگە و شێوازی زۆرتردا هاتوە کە هەر ئەم مانایە دەدەن.

جا ڕاستگۆی بە ڕاست دانراو ﷺ فەرمووی کە بە بەردەوامی کۆمەڵێك یاساغ دەکرێن لە ئومەتەکەی..! لەسەر ڕاستی و حەق بەهێز و بتەون، نە سەرپێچی کار و سەرنەخەرانیشیان زیانیان پێ ناگەیەنن و

---

[1] ((فەرمودەیەکی صحیحە: ئیمامی بوخاری ٣٦٤١ و ئیمامی مسلم ١٠٣٧ لە فەرموودەی معاویە ی کوڕی ابي سفیانەوە گێڕاویانەتەوە، بەم شێوەیە : (( لا يزال امتي قائمة بامر الله لا يضرهم من خذلم، ولا من خالفهم، حتى ياتيهم امر الله و هم على ذلك)) لە بوخاری دا هاتووە. و ئیمامی مسلم ١٩٢٠ لە فەرمودەی ثوبانەوە بەم شێوەیە (( لا تزال طائفة من امتي ظاهرين على الحق، لا يضرهم من خذلهم حتى ياتي امر الله و هم كذلك))، و هەروەها ئیمامی مسلم ١٩٢٤ لە فەرموودەی عقبة بن عامر دا هێناویەتی: (( لا تزال عصابة من امتي يقاتلون على امر الله، قاهرين لعدوهم، لا يضرهم من خالفهم حتى تاتيهم الساعة وهم على ذلك)). گێڕاویەتیەوە)).

کاریان تێ ناکەن..!! بەڵام مانـەوەی ئیـسلام بـەنامۆیی و بـە زەلیلـی لەسەر زەوی پێش هاتنی قیامەت بە هیچ شێوەیەك ڕوونادات..!

وە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ: (( ثم يَعُودُ غَرِيبًا كَمَـا بَـدَأَ )) دووبارە نامۆ دەبێتەوە وەکو سەرەتا، بەڵێ.. گەورەترین نامۆبوونی کاتێك دەبێت کە هەندێك لەوانـەی لـە نێویـدان، لێـی دەردەچـن و مورتـەد دەبنەوە..! هەربۆیە خودای بەرز و بڵند دەفەرموێت: ﴿ مَن يَرْتَدَّ منكُمْ عَن دينه فَسَوْفَ يَأْتي اللّهُ بقَوْمٍ يُحبُّهُمْ وَيُحبُّونَهُ أَذلَّة على الْمُؤْمنينَ أَعزَّة على الْكَافرينَ يُجَاهدُونَ في سَبيلِ اللّه وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئـمٍ ﴾ ( المائدة : ٥٤ )

واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە..! هەرکەسێکتان لە ئاینی خۆی پاشگەزببێتەوە و وەرگەڕێ، جا خوا لەمـەولا کەسـانێك دێـنی - ئەوەندە بەفەرمانی دەبەن - خۆشی دەوێـن و، ئـەوانیش ئـەویان خـۆش دەوێت، وە لەئاسـتی خـاوەن باوەڕانـدا، خـۆ بەکـەمزان و بەسـۆزن، وە بەرامبـەر کافرانـدا خـۆ بەگـەورەزان و سـەربڵند و تونـدوو تیـژ و بەهەڵمەتن، وەبۆ ڕەزامەندی خوایش تێدەکۆشن و جەنگ دەکەن، وە لـە شەڕ و لۆمەی لۆمەکەرانیش ناترسن و باکیان نیە.

جا ئەوانەن ئیسلام بەرز دەکەنەوە لەدوای ئەوانەی کە خۆیـان لـە دین دەردەکەن.

هەر بەو شێوەیەش نامۆ دەبێتەوە لـە زۆر شـوێن و کاتـدا، دواتـر دەردەکەوێتەوە تاوەکو خودای تەبارەك وە تـەعالا چەسـپاوی دەکاتـەوە، هەر وەك چۆن لەکاتی خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا خوا لێی ڕازی بێت، کاتێك بووبە جێ نشین زۆرێك لە ئاینی ئیسلام تەواو غەریب بووبوو لای زۆربەی خەڵك، هەتا گەیشتبوە ئەوەی کە خەڵکانێك هەبوون نەیاندەزانی خواردنەوەی مەی حەرامە، جـا خـوای گـەورە بـەهۆی عومـەری کوڕی عبدولعەزیزەوە ئەوەی نامۆبووبوو، دووبارە دیار و باڵای کردەوە.

وە لە سونەتدا هـاتوە: " إن الله يبعث لهذه الأمة في رأس كـل مائة سنة من يجدد لها دينها "[1]

واتە: خوای گەورە لە هەموو سەدەیەکدا کەسێك سەر هەڵـدێنێت کە ئاین بۆ ئەو سەدەیە تازە دەکاتەوە. جا تازە کردنەوەش لەدوای تۆزاوی بـوون و خـۆڵاوی بـوون - ئاشـکرانەبوونی - دەبێـت، جـا ئەوەشـە نامۆبوونەکەی ئیسلام.

هەر بۆیە ئەم فەرموودەیە ئەوەمان بۆ دەردەخـات کـە موسـوڵمان نابێت نیگەران بێت بە کەمی ئەو کەسـانەی کـە لـە ڕاسـتی ئیـسلام

---

[1] ( حديث حسن: ئیمامی ابو داود ٤٢٩١، و الحاكم لە المستدرك ٥٦٧/٤، و الطبراني لە المعجم الأوسط ٦٥٢٧ لە ڕێگەی شراحيل کوڕی يزيد المعافري، لە ابي علقمة، عن ابي هريرة وە ﷺ ... گێڕاویانەتەوە.

تێگەیشتوون..! وە سنگی تەنگ هەڵنەیەت، وە نەشکەوێتە گومانـەوە لە ئاینی ئیسلام، هەرچۆن ئەو کاتەی کە سەرەتا سەری هەڵدا وایە...!

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ فَاسْأَلِ الَّذِينَ يَقْرَؤُونَ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكَ ﴾ (يونس: ٩٤)

واتە: جا ئەگەر گومانێکت هەبێت لەوەدا کە بۆمان دابەزاندویت ئەی پێغەمبەر ﷺ، دەبچۆ لەو پیاو چاکانە پرسیار بکـە کـە لـەپێش تۆوە کتێب و نامەی (تەورات و ئینجیل) یان دەخوێندەوە، دیارە کە بـە ئاینی خۆیان موسوڵمان بوونە، وە بێگومـان لەلایـەن پەروەردگارتـەوە حەقت بۆهاتووە و گومانی تێدانیە..

وە ئایـەت گـەلێکی تـریش کـە بەڵگـەن لەسـەر ڕاسـتی و ڕاستەقینەیەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

ئەڵبەتە بەهەمان شـێوەش کاتێـك کـە نامۆدەبێـتەوە پێویـستە خاوەنەکـەی - پـەروەردگار- بەڵگـەو ڕونکـاری بـدات بـۆ ئـەهل و هەڵگرانی پەیامەکەی، هەرچۆن پێویست بوو لە سـەرەتای سـەردەمی سەرهەڵدانیدا - بەڵگەو ڕونکاری بدات- ، هەر وەك پـەروەردگار پێـی دەفەرموێت: ﴿ أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ الَّـذِي أَنـزَلَ إِلَـيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلًا وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُ مُنَزَّلٌ مِن رَّبِّـكَ بِالْحَقِّ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ (١١٤) وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا

وَعَدْلًا لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (١١٥) وَإِنْ تُطِعْ أَكْثَرَ مَنْ فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ (١١٦)﴾. (الأنعام: ١١٤-١١٦).

واتە: پێیان بڵێ: ئاخۆ ڕەوایە جگە لە خودای بە دەسەڵات کەسی تر بکەمە دادوەری نێوانمان؟ تاوەکو شایەتی بدات کامەمان ڕاست دەکات، وە هەر ئەویشە ئەم قورئانەی بە ڕۆشنکراوەیی دابەزاندۆتە خوارەوە بۆتان، وە سەرجەم بڕیارەکانیشی ڕوونە، خۆئەوانەش وانامەمان پێداون، چاك دەزانن کە ئەو قورئانە لەلایەن پەروەردگارتەوەیە، وە گشتیشی ڕاست و دروستە، دەسا تۆ هەرگیز لە خەڵکانی دوو دڵ و بەگومان مەبە، وە گومانت نەبێ کە ئەم قورئانە خوا ناردوویەتی (١١٤) گشت وتەکانی پەروەردگارت (قورئان)و وە سەرجەم بڕیارەکانی لەڕاستی و دادگەریدا تەواو بەپایان گەیشتون و بێ وێنەن، وە نابێ هیچ کەس دەستکاری و ئاڵوگۆڕیان بکات، وە تەنها خودایە کە بیسەری تەواوە و زانایە بەهەموو شتێك (١١٥) ئەگەر لەزۆربەی خەڵکانی ئەم سەر زەویە، کە بێ باوەڕن پەیڕەوی بکەیت، ئەوا لە ڕێگەی خودا لات دەدەن و چەواشە و سەر لێ شێواوت دەکەن، چونکە خۆشیان هەر دوای دوو دڵی و بەدگومانی دەکەون، وە هەر بەگومانی پڕوپوچ خەریکن و هیچ بەڵگەشیان نیە (١١٦).

هەروەها فەرمویەتی: ﴿ أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴾ ( الفرقان : ٤٤ )

واتە: ئایا پێت وایە کە زۆربەیان ووتەکانت بەدڵ ئەبیسن، بیر لە مانا و مەبەستەکەی دەکەنەوە و تێدەگەن؟ خۆ ئەوانە هەر وەك مالاَتن (بزن و مەڕ و ووشتر و گا) کەخاوەنی بیرکردنەوە نین، بەڵکوو لەوانەش گێلتر و نەزانترن، چونکە زۆر جار ئاژەڵ بەگوێی خاوەنەکەی دەکات و هەرکەسیش چاکەی لەگەڵ بکات لە بیری ناچێت..!

جا دەکرێت نامۆبوونەکەی لە هەندێ لایەنی شەریعەتەکەیەوە بێت، وە دەشکرێ ئەمەش تەنها لە هەندێ شوێندا ڕوبدات، یاخود لە زۆرێك لە شوێنەکاندا گەلێك بەشی شەریعەتەکەیان لێ وون ببێت، یان نەزانراوبێت کە دەیگەیەنێتە ئاستی نامۆبوون - غەریب بوون - بەشێوەیەك کە کەسیان نەیزانن مەگەر دانە دانەیەکیان نەبێت...!

خۆ سەرەڕای ئەمەش، خۆشبەختی و سەرفرازی بۆ شوێنکەوتوانی ئەو شەریعەتەیە، هەرچۆن خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانیان کردووە، وە بە دڵنیاییەوە دەربڕین و دەرخستن و فەرمان کردن و ئینکار کردن لەسەر ئەو کەسانەی کە بەرهەڵستی دەکەن بەپێی پێ کران و پشتیوانی کردنە - واتە بەو پێیەی تا چەند بۆت دەکرێت و تاچەند پشتیوانت هەیە -، ئەوەتا پەیامبەر ﷺ دەفەرمویت: " من رأى منكم

منكرا فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه، فإن لم يستطيع فبقلبــه، ليس وراء ذلك من الإيمان حبة خردل"[١]

واتە: هەركەس لە ئێوە كارێكی نادروست و ناشــەرعی بـینی بـا بەدەستی بیگۆڕێـت بۆ چاكە، خۆ ئەگەر نەیتوانی بـا بـە زمـان - بـە قسە- بیگۆڕێت، وە ئەگـەر نـەیتوانی بـا بـە دڵـی، لـەدوای ئـەوەوە تۆسقاڵێكیش ئیمانی نیە.

یان ئەگەر كەسانێك لە خەڵك توانیان زیانی دونیایی و قیامــەتی بەو كەسە نامۆیە بگەیـەنن بەپێـچەوانەی بەڵێنەكـەی پـەروەردگار و پێغەمبەرەكەی ﷺ و شوێنكەوتوانی، جا ئەوە بەهۆی گوناه و تـاوان و ناتەواوی ئیسلامەتیەكەیەوەیە، وەكو ئەو شكـستەی كـە لـە جـەنگی ئوحدا توشی یارانی پێغەمبەر ﷺ بوو - كە سەرپێچی پێغەمبــەریان كرد ﷺ -، مەگەر نا.. خۆ خودا خۆی دەفەرمویت: ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ ﴾ ( غافر : ٥١ )

---

[١] (فەرموودەیـەكی صـحیحە: ئیمـامی مـسلم ٤٩، ئیمـامی ئـەبو داود ١١٤٠، وە ئیمـامی ترمزی٢١٧٢،وە ئیمـامی نەسائی ٥٠٠٨، وە ئیمـامی ئیبن ماجە ١٢٧٥، لە فەرموودەی ئەبی سـەعیدی خودریـەوە گێڕاویانەتـەوە، جگـە لـە برگـەی (لیس وراء ذلك من الإيمان حبة خردل ).

واتە: بێگومان ئێمە یارمەتی پەیامبەرانمان و ئەوانەش بڕوایان هێناوە ئەدەین، وە لە ژیانی دونیادا بەسەر دووژمنانیاندا سەریان ئەخەین، سەر خستنی پەیامبەران و بڕواداران ئەویە، وە لەو ڕۆژەشدا کەشایەتدان - کەپێغەمبەران و فریشتەکان - هەڵئەسن و ڕاست دەبنەوە بەشایەتی دان لەسەر ئەوانەی کە درۆیان لەسەر خوا کردوە.

یان ئەوەی کە فەرمویەتی : ﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنصُورُونَ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ ﴾ ( الصافات : ١٧١- ١٧٣ )

واتە: بەڕاستی لە بابەت بەندە نێردراوەکانمانەوە بڕیارمان دەرچووە (١٧١ )کە بەڕاستی هەرئەوان و شوێنکەوتوەکانیان یارمەتی دەدرێن هەم بە بەڵگە، هەم لەجەنگدا (١٧٢) بێگومانیشبە هەر لەشکری خوا زاڵ و سەرکەوتووە بەسەر دووژمناندا ( ١٧٣)

وە یان لەو چیرۆکانەی کە خودا لە بەسەرهاتی پەیامبەران و شوێنکەوتوانیان و سەرکەوتنیان و ڕزگارکردنیان، وە لوت شکاندن و شکستی دووژمنانیان باسی کردووە، پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆمان، وە خوداش زاناترە...

جا ئەگەر وترا : فەرمایشتی خودای تەعالا: ﴿ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ على الْمُؤْمِنِينَ

أَعِزَّةٍ على الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئِمٍ﴾ ( المائدة : ٥٤ )

واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە..! هەرکەسێکتان لەئاینی خۆی پاشگەزبێتەوە و وەرگەڕێ، جا خوا لەمەولا کەسانێك دێنی ئەوەندە بەفەرمانی دەبن خۆشی دەوێن و، ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێت، وە لەئاستی خاوەن باوەڕاندا، خۆ بەکەمزان و بەسۆزن، وە بەرامبەر کافراندا خۆ بەگەورەزان و سەربلّند و توندوو تیژ و بەهەلّمەتن، وەبۆ ڕەزامەندی خوایش تێدەکۆشن و جەنگ دەکەن، وە لە شەڕو لۆمەی لۆمەکەرانیش ناترسن و باکیان نیە......،گوتەیەکە بۆ ئەو سەدەیە....!

هەروەك فەرمایشتی خودای گەورە: ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ ( النور : ٥٥ )

واتە: بێگومان خودا بەو کەسانەتان بەلّێنی داوە کە بڕوایان هێناوە و کاری چاکەیان ئەنجامداوە، کە لەم زەمینەدا بیانکات بەجێنشین و، کلیلی دەسەلاّتداری دوونیان تەسلیم بکاو، وە بیان کات بە خەلیفەی ڕووی زەوی، هەروەك مووسولّمانانی پێش ئەوانی کردە جێنشین.

بۆ ئەمەش پێغەمبەری خودا ﷺ ڕوونی کردەوە کەئەوانە خەڵکی یەمەنن، ئەوانەی هاتنە نێو ئیسلامەوە لە کاتێکدا هەرچی پاشگەز بوویەوە لە عەرەب پاشگەز بوویەوە، هەروەك بەڵگەشە بۆ ئەوەی لە کۆتا زەماندا ئیماندار نامێنێت.

خۆ وتراویشە: فەرمایشتی خوای گەورە ﴿ ياأيهاالَّذِينَ آمَنُوا ﴾ گوتارە بۆ هەموو کەسێك کە قورئانی پێ گەیشتبێت لە ، ئیمانداران هەروەك باقی هاوشێوەکانی ئەم دەربڕینە، - بە مانایەکی تر بڕگەی ﴿ ياأيهاالَّذِينَ آمَنُوا ﴾ بۆ هەموو ئیماندارێکە لە هەموو سەردەم و شوێنێکدا - وەك چۆن خودا دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِل الصَّلاةِ...﴾ (المائدة : ٦)

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە..! هەرکە ویستان هەڵسن بۆ ئەنجامدانی نوێژ....، وە هاوشێوەکانی - ئەمە پێش گوفتارێك بوو- ، جا هەرواش فەرمایشتی پەروەر دگارمان: ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ (النور : ٥٥)

واتە: بێگومان خودا بەو کەسانەتان بەڵێنی داوە کە بڕوایان هێناوە و کاری چاکەیان ئەنجامداوە، کە لەم زەمینەدا بیانکات بەجێنشین و، کلیلی دەسەڵاتداری دونیایان تەسلیم بکاو، وە بیان کات

بە خەلیفەی ڕووی زەوی، هەروەك موسوڵمانانی پێش ئەوانی کردە جێنشین... بۆ هەموو سەردەم و کات و شوێنێکە..!

هەردوو باسی ئایەتەکان ڕوویانداوە ڕووش دەدەن هەرچۆن خوای گەورە خۆی هەواڵی داوە، جا بە دڵنیاییەوە ئەگەر خەڵکانێك لەم ئیسلامە هەڵگەڕێنەوە ئەوا یەقینەن خوای گەورە خەڵکانێك ئەهێنێت کە خۆشیان دەوێت. ئەوانیش تێکۆشان و جیهاد دەکەن لە پێناوی دا، کە ئەوانیش گرۆی سەرکەوتوون -طائفة المنصورة - تاوەکو ڕۆژی قیامەت..!!

ئەمەشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە لە ڕوانگەی دەربڕینی فەرمایشتی نەهی کردن لە دۆستایەتی کافران و بێ باوەڕان، جا خوای تەعالا دەفەرمووێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (٥١) فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَى أَنْ تُصِيبَنَا دَائِرَةٌ فَعَسَى اللَّهُ أَنْ يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِنْ عِنْدِهِ فَيُصْبِحُوا عَلَى مَا أَسَرُّوا فِي أَنْفُسِهِمْ نَادِمِينَ (٥٢) وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا أَهَؤُلَاءِ الَّذِينَ أَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَأَصْبَحُوا خَاسِرِينَ (٥٣) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ

آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (٥٤)﴾ (المائدة :٥١- ٥٤ )

واته: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکە و گاور مەکەنە دۆست و پشتیوانتان، چونکە هەندێکیان پشتیوان و یارمەتی دەری هەندێکیانن و، لەبەر ئێوەش دەست لە دینی خۆیان هەڵناگرن و، گشتیشیان بۆ ئێوە دەبنە یەك دەستە و بەستە، و لەرۆژی خۆیدا گەلەکۆمەتان لێدەکەن، وە هەرکەسێکیشتان دۆستایەتیان لەگەڵ بکا ، و بیانکا بە یارمەتیدەر و دۆستی خۆی، یان هاوکاری بکات دژ بە موسڵمانان و هاوڕێیان بکات، بێ شەك ئەو کەسە هەر لەوانە و بەوان دادەنرێت، بێگومان خودا هیدایەت و ڕێنمای گەلی ناهەق و ستەمکار ناکات، دیارە ئەوانە کەدەبنە دۆست و هاوکاری جولەکە و فەلە و، سنووری خودا دەبەزێنن و ستەمکارن، خواش هاوکاری خەڵکانی وا ناکات(٥١) دەبینی کە لەدڵیاندا بەرامبەر بەدینی ئیسلام گومان و نەخۆشی هەیە (وەکو عبداللە ی کوڕی ئوبەیە و هاوشێوەکانی) وە بۆ بەدۆست بوونیان پەلە و تیژڕەوی دەکەن و خۆدەکێشنە ناویانەوە، وە ئەمە دەکەنە بیانوو و دەڵێن: دەترسین دووچاری بەلا و ڕووداوێك ببین،

بۆیە دەیانکەینە دۆست و پشتیوان و ئاشنای خۆمـان، شـایەد ڕۆژێـك موسـوڵمانەکان لـە جەنگەکانـدا سـەرکەون، ئەوسـا ئێمـەیش هـیچ پەنایەکمان نەمێنیٚ، خاوەننامەکان – کتێبە ئاسمانیـەکان - دەکەینـە دۆست، با لـەو ڕۆژە دژوارەدا پـەنامان بـدەن و یارمـەتیمان بـدەن، وە بێگومان خوا بەم زوانە دەرگای خێر و سەرکەوتن لـە پەیامبـەر ﷺ و موسوڵمانان دەکاتەوە، ئەوەبوو مەککە ئـازاد بـوو، جولەکـەی (بـەنی قورەیزە) ڕیسوابوون، یان فەرمانێك لەلایەن خۆیەوە دەریکات بۆ ئابڕوو بردنی ناپاکان، وەکو دانانی سەرانە و جیزیـە لەسـەریان، ئەوسـا ئـەو تاقمە دوورڕو و تیمان لاوازانە، لەسەر ئەو کارە دزیو و نیازە گلاوەیان کە لەدلا شاردبوویانەوە پەشیمان ببنەوە (٥٢) ئەوسا کـە پـیرۆزی هـات، ئەوانەش کە بڕوایان هێناوە بـە سەرسـوڕمانێکەوە بـەگاور و جولەکـە دەڵێن: ئاخۆ ئەمانە بوون – دووڕوەکان- کـە زۆر بەتونـدی سـوێندیان بەخودا دەخوارد، کە هەتاسەر لەگەڵتانن و پـشتیوانتان، کەچـی خـوا سڕی هەڵماڵین و دەریخست کە درۆیان لەگەڵ کردن، وە ئەو کارانە ئەوان کردیان بەفیڕۆ چوون، وە لەدوایشدا هیچ سـودیان وەرنـەگرت و بـەڵکو زەرەرمەنـد بـوون(٥٣) ئـەی ئەوکەسـانەی باوەڕتـان هێنـاوە..! هەرکەسـێکتان لـەئاینی خـۆی پاشـگەزبیێتەوە و وەرگـەڕێ، جـاخوا لەمەولا کەسانێك دێنی ئەوەندە بەفـەرمانی دەبـەن خۆشـی دەوێـن و،

ئـەوانیش ئـەویان خـۆش دەوێـت، وە لەئاسـتی خـاوەن باوەڕانـدا، خـۆ بەکەمزان و بەسۆزن، وە بەرامبەر کافراندا خۆ بەگەورەزان و سەربڵند و توندوو تیژ و بەهەڵمەتن، وە بۆ ڕەزامەندی خوایش تێدەکۆشن و جەنگ دەکەن، وە لە شەڕو لۆمەی لۆمەکەرانیش ناترسن و باکیان نیە، وە ئەو خۆشەویستی و تێکۆشانە فەزڵ و بەخشـشی خودایـە بـە هەرکەسـێك بیەوێت دەیدا، وە خواش فەزڵ و میهرەبانی فراوانە، وە زۆریـش زانایـە، دەزانێ کێ شایستەی ئەو بەخشندەییەیە (٥٤).

جا ڕوونە کە ئەوانەی باسکراون کە نابێ ئیمانداران دۆستایەتی و پشتیوانی و سەرخستنیان بۆیان هەبێت (یهود-جولەکـە، - نـصاری- گاورو خاچ پەرستان)و ئەوانەش کە لە ئایەتی( الردة ) واتە هەڵگەڕاوە و دەرچووان لە دین - خۆیان موسوڵمانن بەڵام خۆیـان کافردەکـەن - ، ڕوون و ئاشکرایە کە ئەمە بەردەوامە لە هـەموو سـەدەکانی ئەمـەنی ئومەتدا ..! جا خودا کاتێ نـەهی کـردووە – یاسـاغی کـردووە – کـە پشتیوانی کافران بکرێـت، ئەوەشـی ڕوونکردۆتـەوە ئەوانـەی کـە ئـەم گوتەیان لەگەڵ وتراوە - ئیمانداران- ئەگەر پشتیوانی کـافران بکـەن، ئەوە لەوان – لە کافران - دەبن، - پەنامان بەخوا -، ڕوونی کردۆتـەوە ئەوەشی پشتیوانیان بێت و- هەڵگەڕاوە - مورتەد بێتەوە لە ئیـسلام، ئەوا هیچ زیانێك بـە ئیـسلام ناگـات ، بـەڵکو خواگیـان خـەڵکانێك

دەهێنێت کەخۆشیانی دەوێت و خۆشیان دەوێت، وە پشتیوانی ئیمانداران دەکەن نەك کافران..! وە جیهاد و تێکۆشـان دەکـەن لـە ڕێگـەی خـودا ناشترسن لە لۆمەی لۆمــەکاران ...! هـەروەك خـودای گـەورەی خـاوەن دەسەلات و دانا و کاربەجێ دەفەرموویـت: ﴿ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَؤُلاء فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُواْ بِهَا بِكَافِرِينَ ﴾ (الأنعام : ٨٩)

واتە: ئینجا ئەگەر ئەمانە ئەی پێغەمبەر ﷺ..! کافر و بـێ بـڕوا بن بە پێغەمبەرێتی تۆ و بە ئایەتـەکانمان، ئـەوە بەڕاسـتی ئـەو کـارە دەدەینە دەستی تاقم و گەلێکی تر، وەکو (ئەنـسار و موهـاجر)، ئـەوان کافر و بێ بڕوا نابن پێی و دەشی پارێزن و تەسلیمی دەبن.( ٨٩).

جا ئەوانـەی کـە ناهێنـەوە نێـو ئیـسلامەوە، وە ئەوانـەش کـە دەردەچن - هەڵدەگەڕێنەوە- لێی دوای ئەوەی کە لە نێو ئیسلامدابوون، هیچ زیانێـك بـە ئیـسلام ناگەیـەنن، بـەڵکو خـودا لـە ئیمـان داران هەڵدەسێنێت بە کارکردن بەوەی کەپێغەمبەری خوا ﷺ بۆی نێـردرا و ئاینەکەشی سەردەخات، تاوەکو قیامەت. هەروەهاش بوو کە خـەڵکی یەمەن، ئەوان لەو کەسانە بوون کـە خـودا هێنایەکایـەوە لەکاتێکـدا ئەوەی هەڵگەڕاوە ... هەڵگەڕاوە لە ئاینی ئیـسلام، لـەوەش بـزانین کـە ئایەتەکـە تایبـەت نیـە بـۆ ئـەوان، وە هـیچ بەڵگەیـەك نیـە لـە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ کـە ئـەو ئایەتـە تایبـەت بکـات بـە

ئەوانەوە، بەڵکو خودا هەواڵی ئەوەشی داوە کە جگە لە خەڵکی یەمەنیش بهێنێتەکایەوە بۆ نمونە ڕۆڵەکانی فارس پاش ئەوان، کە هاتنە نێو ئیسلامەوە...! بەڵکو خودای تعالی دەفەرموورێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ انفِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ أَرَضِيتُم بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنَ الآخِرَةِ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ إِلاَّ تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلاَ تَضُرُّوهُ شَيْئًا وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ (التوبة : ٣٨ -٣٩)

واتە: ئەی ئەوانە باوەڕتان هێناوە چیتانە کەپێتان دەگوترێت ڕاپەڕن و بچنە جیهاد لەڕیگای خوادا، لەشگران و تەمەڵ دەبن و، بەزۆر خۆ دەنوسێنن بە زەویدا، و دوای پێغەمبەر ﷺ ناکەون بۆغەزای (تەبوك)، ئاخۆ لەبەر ئەوە بێ کەژیانی ئەم دورنیایەتان لە قیامەت پێ باشتربێ..؟! جا ئەگەر لەبەر ئەوەبێ، خۆ ژیانی ئەم دوونیایە لەچاو ژیان و گوزەرانی دوا ڕۆژدا، شتێکی زۆر کەمە و بێ بایەخە (٣٨) ئەگەر گشت بەجارێك بەرە و مەیدانی جیهاد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕانەپەڕن و دەرنەچن، خوا سزایەکی ئێش پێکەیەنەرتان ئەدا و دووژمنیش زاڵ ئەکات بەسەرتاندا، ئێوە لادەبا و خەڵکانێکی تر دەخاتە جێگاتان، ئەوجا ئەوانە وەکو ئێوە نابن و، دیفاع لە پێغەمبەر ﷺ دەکەن و، وەڵامی دەدەنەوە بۆ جیهاد، خۆ بە دواکەوتنیشتان لە جیهاد ناتوانن

بەرهەڵستی بوەستن و هیچ جۆرە زیانێکی پێ بگەیەنن، وە خواش بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، دەتوانێت لەناوتان ببات و، خەڵکی تربهێنێتە جێگاتان (٣٩).

وە ئەمەش بە هەمان شێوە گووتارە بۆ هەموو سەردەمێك و سەدەیەك، بەدڵنیایشەوە ئەو هەواڵەشی تیایە کە هەرکات کە کەسانێك سستی و خاوی و تەمەڵی و تەوەزلی بکەن لە جیهاد و تێکۆشان و بانگەواز و فەداکاری، ئەوا سزایان دەدات و دەیانگۆڕێت بەکەسانێك کە هەڵدەستن بە جیهاد و تێکۆشان، وە ئەمەش خودی واقعە - ڕاستیە -.

بەهەمان شێوە گورتەی خوای پەروەردگار لە فەرمایشتێکی تردا:

﴿ هَاأَنتُمْ هَؤُلَاء تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِ وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنتُمُ الْفُقَرَاء وَإِن تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ ﴾ (محمد ٣٨)

واتە: ئا ئەوە ئێوەن بانگ دەکرێن - ئەی موسوڵمانان- ..! بۆ ئەوەی ماڵ و سامانتان لەڕێگەی خودا ببەخشن و بچنە جیهاد، جا هی وا هەیە چروکی دەکات و ماڵی بەخت ناکات، وە ئەگەر هەر کەسێکیش چروکی بکات ئەوا هەر لە خۆی چروکی دەکات، وە خواش دەوڵەمەندە و ئێوەش هەژار و موحتاجن بەو، وە خوا دەیەوێت ئێوە

بەشان و شەوکەت بن، بۆیە ماڵ و سامانتان پێ بەخت دەکات، نەك لەبەر ئەوەبێت سود و کەڵکێ بەو بگات، وە خوا شەرەفی هەڵگرتنی ئەم پەیامەی بەئێوە داوە، ئەبێ ئێوەش لەپێناویدا جیهاد بکەن و سامانتان بەخت بکەن، خۆ ئەگەر لەم دینە پشت هەڵ بکەن و ئامادە نەبن بۆ جیهاد و چروك و پیسکە بن لە بەخشینی ماڵ لە ڕێگەی جیهاددا، ئەو کات خوای گەورە ئێوە دەگۆڕێت بەقەوم و گەلێکی تر، و ئەو شەرەفەتان لێ دەسێنێتەوە، ئەوسا ئەوانیش وەك ئێوە نابن(٣٨).

جا بۆیە خوای پەروەردگار هەواڵی ئەوەی پێداوین کە هەرکەس پشت هەڵبکات لە جیهاد و تێکۆشان بە گیانی خوێ و وازبهێنێت لە ماڵ بە خشین لەڕێی پەروەردگار، ئەوا خودا دەیانگۆڕێت بە کەسانی تر - کە ئەوکارانە بکەن -.

جا ئەمەحاڵی ترسنۆك و ڕەزیل و چروکانە، خودا دەیانگۆڕێت بە کەسانێك کە ئاینی ئیسلامیان پێ سەردەخات و دەشبەخشن لە پێناویدا، جا حاڵی ئەو کەسە چۆنی لێ بەسەرییێت کە لە بنەڕەتی ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە ...؟! بۆیە خوا خەڵکانێك دەهێنێت خۆشیانی دەوێت و ئەوانیش خودایان خۆش دەوێت، کە مل کەچبن بۆ ئیمانداران، بەهێز و بەزەبریش بن بەرامبەر کافران، کەتیدەکۆشن و جیهاد دەکەن لە پێناو خوای پەروەردگاردا و لە لۆمەی لۆمەکارانیش ناترسن.

جا ئەمەش لە سیفەتی زانایانە، پەرستن و کوشتن - جیهاد - و ماڵ بەخشین، لەگەڵ چوار کۆمەڵەکەی تری ئیماندارانی تێکۆشەر و موجاهیدی سەرکەوتوو تاوەکو ڕۆژی دوای، هەرچۆن خەڵکی تێیاندا هەیە کە مورتەد- هەڵگەڕێتەوە-، و هەشە ناپیاوی و تەمەڵی دەکات لە جیهاد و تیکۆشان، هەشە چرۆکی و ڕەزیکی دەکات لەماڵ بەخشین دا...!

وە بەهەمان شێوە فەرمایشتی پەروەردگار: ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّـذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِـي الْـأَرْضِ كَمَـا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ (النور : ٥٥)

واتە: بێگومان خوا بەو کەسانەتان بەڵێنی داوە کە بڕوایان هێناوە و کاری چاکیان ئەنجامداوە، کە لەم زەمینەدا بیانکات بەجێنشین و، کلیلی دەسەڵاتداری دورنیایان تەسلیم بکات، وە بیان کات بە خەلیفەی ڕووی زەوی، هەروەك موسوڵمانانی پێش ئەوانی کردە جێنشین، وە ئەو دین و ئاینەش خوا خۆی بۆی پەسەند کردوون، ڕیشەدار و سەقامگیر و سابت و دامەزراو دەکات بۆیان، وە ترس و بیمەکەشیان بۆ دەگۆڕێت بە ئارامی و ئاسودەی ئیتر ئەو کاتە تەنها من بپەرستن و هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشم، وە ئەوسا هەرکەسیش پاش ئەوە کافربوو، ئا ئەوانە فاسیق و دەرچون لەسنوری شەرع (٥٥).

جا ئا ئەمە بەڕاستی بەڵێن و پەیمانێکی شایستەیە بۆ کەسێك کە بەو وەسفاتە وەسف بکرێت، وە هەرکەسێك خۆی بەو وەسفانە جوان و قەشەنگ بکات، جا بۆیە ... کە ئەوانەی سەرەتا - هاوەڵان- بەو وەسفانەوە خۆیان جوانکرد بەپێی ئیمان و کردارە چاکەکانیان، وە هەرکەسێیش دوای ئەوان هات، تاوەکو باوەڕی تەواوتر و کاری باشتر بێت، ئەوە بەسەردارکردن و جێنیشین کردنەکەی کە باسکراوە باشتر و تەواوتر دەبێت، خۆ ئەگەر کەم و کورتی تێدابێت، ئەوا لە هێزو سەروەری کردنەکەشیان دا کەم وکورتی دەبێت ...! وە ئەمەش پاداشتی ئەو کردەوانەیە، جا هەرکەسێك بەو کارە هەستا ئەوا شایستەی ئەو پاداشتەیە .

بەڵام ئەفسوس هیچ سەدەیەك نەما وەکو سەدەی یەکەمی ئیسلام - سەردەمی هاوەڵان-، جا بۆیە هیچ سەدەیەکیش هێز و دەسەڵاتی وەکو سەردەمی یەکەم نابێت، بۆیە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرمووی : " خير القرون القرن الذي بُعِثْتُ فيهم، ثم الذين يلوهم، ثم الذين يلوهم "[1]

---

[1] فەرمودەکە صحیحە : ئیمامی بوخاری ( ٢٦٥١) و ئیمامی مسلم ( ٢٥٣٥) لە فەرموودەی عمران بن حصين، و سەرەتاکەی لای ئیمامی بوخاری ئەم بڕگەیە (( خيركم قرني)) . لای ئیمامی مسلم (( إن خيركم قرني )) ـە ، وە لای ئیمامی بوخاری(٢٦٥١) و ئیمامی مسلم (٢٥٣٥) لە فەرموودەیە عبدالله بن مسعود ، کە

واتە: باشترین سەدەکان ئەو سەدەیەیە کە نێردرام تیایاندا، دواتــر ئەوانەی پاش ئەوان دێن، دواتر ئەوانەی پاش ئەوان دێن.

بەڵام دەکرێت ئەمە بۆ هەندێ خەڵکی سەدەکە بووترێت، هەرچۆن ئەمە ڕوودەدات بۆ موسوڵمانان لە هەندێ ڕووەوە، هەرچۆن ئەوە زانراوە لە هەموو کاتێکدا - مەبەست: دەکرێـت ئـەو باشـبوونە بـۆ هەنـدێ خەڵکی سەردەمێك بێت، هەرچۆن لە هەموو زەمانیکدا ڕوودەدات کە هەندێك لە موسوڵمانان باشترین بن- خواش زاناترە .

وە ئەما فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ: " إن الله يَبْعَثُ ريحـاً تَقْبَضُ روحَ كُلَ مُؤمِنٍ "[1].

---

سەرەتاکەی بە بڕگەی (( خير الناس قرني )) هاتووە ، وە بەشێوەی تریش هاتووە، بەڵام بە بڕگەی (( خير القرون )) نەهاتووە .

[1] فەرمودەکە صحيحە: ئیمامی مسلم ( ٢٩٣٧) لە فەرموودەی ( النواس بن سمعان) ﷺ، لە فەرموودەیەکی درێژدا کە دەربارەی ئاشووبی دەججال هاتووە دەگێڕێتەوە، لە کۆتاییەکەی دا (( فبينما كذلك إذ بعث الله ريحاً طيباً ، فتأخذهم تحت آباطهم ، فتقبض روح كل مؤمن وكل مسلم )) واتە : بەو شێوەیە دەبێت تاکو خودای گەورە بایەکی چاك دەنێرێت گیانی هەموو ئیماندارێك و هەموو موسوڵمانێك دەکێشێت .

واتــه: خــودا بايــەك هەڵــدەكات و گيــانى هــەموو ئيمانــدارێك دەكێشێت. جا لەم كاتــەدا بابــەتى ( الــردة ) هەڵگەڕانــەوەى تيايــە، بەڵكو مردنى ئيمانــدارى تێدايــە، بۆيــە نەيفــەرموو( إذا مــات كــل مــؤمن ) واتــە (ئەگــەر هــەموو ئيمانــدارێك مــرد)، تــاكو خــودا بيانگۆڕێت بە كەسانى تر، بەڵكو ئەو بەڵێنەى كە داويەتى بۆ كاتێكە كە هەندێك لە دينەكەى هەڵگەڕێتەوە – مورتەد- بێتەوە

وە ئەوەش لەو دەقانەيە كە دەكرێتە بەڵگە بۆ ئەوەى كــە هــەرگيز ئەم ئوممەتەى ئيسلام كۆنابێتەوە بە گشتى لەسەر گــومڕايى، هــەروەها هەرگيز بە گشتى مورتەد نابێتەوە، بەڵكو دەبــێ خــودا هەميــشە لــە ئيمانداران دەهێڵتەوە و ديار و ئاشكران هەتاوەكو هەستانى قيامــەت، خۆ ئەگەر هەموو ئيمانداران مردن، ئەوكاتەش قيامەت هەڵدەسێ.

وە ئەمــەش هەرچۆن لە فەرمايشتى زانــست داهــاتووە: " ان الله لا يقبض العلم انتزاعاً ينتزعه من الناس ، ولكن يقبض العلم بقبض العلماء ، فاذا لم يبق عالم اتخذ الناس رؤساء جهالاً، فسئلوا فــأفتوا بغير علم ، فأضلوا و اضلوا "[1]

---

[1] فەرمودەكە صحيحە: ئيمامى بوخارى ١٠٠، و ئيمامى مسلم ٢٦٧٣ گێڕاويانەتەوە.

واتە : بە دڵنیایەوە خودا زانست هەڵناگرێتەوە کە هەڵی بگرێتەوە لە نێو خەڵکی دا، بەڵکو هەڵدەگەرێتەوە بە- مردنی- بردنەوەی زانایان، جا کە زانا نەما، ئەوا خەڵکی سەرکردە و سەرانێکی نەزان دادەنێن، جا پرسیاریان لێ دەکەن ئەوانیش بەبێ زانست فەتوا دەدەن، جا – سەرکردە و سەرەنەزانەکان- گومڕا دەبن و- خەڵکەکە- گومڕادەکەن. کە فەرموودەکە بەربڵاوە لەسەرچاوە ڕاستەکاندا لە فەرموودەی عبداللە کوڕی عومەر ﷺ لە پێغەمبەری خوا ﷺ .

خۆ ئەگەر ووترا : خۆ فەرمایشتی ( فەرموودە ) ی { ابن مسعود } ەوە و جگە لەریش دا دەفەرمووێت: " يسرى على القرأن فلا يبقى في المصاحف منه أيةٌ ولا في الصدورى منه أيةٌ "[1]

واتە: شەوێك بەسەر قورئاندا دێت کە هیچ ئایەتێك لە نێو پەرتووکەکەدا نەماوە، وەهیچ ئایەتێکی لە سنگی خەڵکدا نامێنێت ... وە ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە..!؟

---

[1] اثر حسن : ئیمامی ابن ابي شيبة لە المصنف (١٤٥/٦) و ئیمامی عبدالرزاق لە المصنف (٣٦٣/٣٦٢/٣) و ئیمامی حاكم لە المستدرك (٥٤٩/٤) و ئیمامی طبراني لە المعجم الكبير (١٤١/٩)دا لە ڕێگەیەکەوە لە عبدالعزيز بن رفيع ، لە شداد بن معقل ، لە ابن مسعودەوە ﷺ...گێراویانەتەوە .

جـا لەوەڵامـدا دەترێـت: بەڕاسـتی وا نیـە کـە ئەگـەر زانـست هەڵگیرایەوە..! قورئانیش هەڵدەگیرێتـەوە - لەهـەمان کاتـەدا - ، بـە بەڵگەی فەرموودەیەکی تـر : "( هذا أوان يقبض فيه العلم ) فقـال بعض الانصار : وكيف يقبض وقد قرأنا القرأن و اقرأناه نساءنا و ابناءنا ؟ فقال : (( ثكلتك امك ! ان كنت لآحسبك لمن افقه اهل المدينة أو ليست التوراة والآنجيل عند اليهود و النصارى ؟ فمـاذا يغني عنهم "[1]

واتە : ( ئەمە کاتێکە زانستی تێدا هەڵدەگیرێتەوە ) ، جا هەندێك لە ئەنصار وتیان: چۆن هەڵدەگیرێتەوە خۆ ئێمە خوێندومانەتەوە و بەژن و منداڵەکانمان خوێندوەتـەوە؟! جـا فـەرمووی: (( ئـەی لـەبار دایـك بچوویتایە! خۆ تۆ لەوانەی کە وام دانا لە زانایانی شاری مەدینـەبیت، ئایا تەورات و ئینجیل لە لای جوولەکە و گاورە خاچ پەرستەکان نەبوو؟ چ سوودێکی پێیان گەیاند؟! )) .

---

[1] فەرموودەکە صحیحە: ئیمامی احمد ( ٢٣٤٧٠) و ئیمامی النسائی لە السنن الكبرى (٥٩٠٩) ، و ئیمامی ابن حبان لە صحیحەکەیدا (٦٧٢٠) ، لەڕێگەی ابراهيم بن ابي عبلة ، لە الوليد بن عبدالرحمن الجرشي ، فەرمووی : جبیر کوڕی نفیر پێی وتین، لە عوفی کوڕی مالیکەوە ﷺ... ، وە ئیمامی ئەلبانی لە ( اقتضاء العلم و العمل ( لاپەرەی ٥٨ ) دا بە صحیحی داناوە.

جا ئەمە ئـەوەی ڕوون کـردەوە کـە تـەنها و تـەنها لەبـەرکردنی قورئان نیـە کەزانـست بهێلێتـەوە، لەکاتێکـدا مونـافیق- دووڕوو- و ئیمانداریش قورئان دەیخوێنێتەوە، هەروەها کەسانێکیش دەیخوێننەوە کە هیچ خوێنەواری و زانستیانیان نیە تەنها بە خۆزگە نەبێ...!

هەربۆیە حەسەنی بەصڕی فـەرمووی: ( العلم علمان: علـمٌ في القلب، وعلم على اللسان، فعلم القلب هو العلم نـافع، وعلـم اللسان حجة الله على عباده ). واتە: زانستی - شەرعی- دوو زانستە (دوو جۆرە): زانستێك کە لە دڵدایە، زانستێکیش کە لەسەر زماندایە، جا زانستی نێو دڵ زانستی بەسوودە، وە زانستی سەرزارەکیش بەڵگـەی خودایە لەسەر بەندەکانی ).

جا ئەگەر خودا زانایانی بردەوە - مراند - ئـەو کـات کەسـانێك دەبن کە قورئان دەخوێنێنەوە بەبێ زانست و تێگەیشتن، ئەوکاتەیە کـە ئەو شەوەی بەسەردا دێت کە لە پەرتووك و سنگی خەڵکدا نامێنێت.

یان ئەگەر ووتیان خۆ لە فـەرموودەی (حذیفة) کـە لـە هـەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ باسی هەڵگرتنەوەی ئەمانەتی کردووە بۆیان کە: " الرجل ينام النومة فتقبض الآمانة من قلبه فيظل أثرها مثل الوكت، ثم ينـام النومـة

فتقبض الآمانة من فلبه فبظل أثرها مثل أثر المجل كجمر دحرجتـــه علي رجللك فتراه منتبراً و ليس فيه شيء "[١]

واته پیاوەکە هەر ئەوەندەی سەرخەوێك دەشكێنێت ئامانەت لە دڵیدا دەردەکێشرێت، شوێنەوارەکەی لە دڵیـدا وەك خـاڵیکی لێـدێت، پاشان سەرخەوێکی دیکە دەشكێنێت و ئامانەت لەدڵیدا دەردەکێشرێت تـاوەکو شـوێنەوارەکەی لەدڵیـدا وەك تلـوقێکی لێـدێت، وەك چـۆن پشکۆیەك خلۆرکەیتەوە بەسەر قاچتار تلۆقـە بکـات، دەبینیـت بـەرز بوتەوە هیچیشی تێدانیه.

دەوترێت: خۆ هەڵگرتنـەوەی ئەمانـەت و ئیمـان.. هەڵگرتنـەوەی زانست نیـە..!؟ خـۆ مرۆڤـی واهەیـە ئیمـان دەهێنێـت بـە زانـستی کەموکورتەوە، جا لەنمونەی ئەم ئیمانە دەکرێ لەسنگی هەڵبگیرێتەوە، وەك نمونەی ئیمانی بەنی ئسرائیل لەو کاتەی کە چاویان بە ( العجل ) گوێرەکە ئاڵتونیەکە کەوت - رێك ئیمانیان بەخوا نەماو هەڵگەڕانـەوە -، بەڵام ئەو کەسەی زانستی وەرگرت لەگەڵ ئیماندا، ئا ئەو ئیمانە لە سـنگی هەڵناگیرێتـەوە، لـە نمونـەی ئەمـەش هـەرگیز لـە ئیمـان

---

[١] فەرموودەکە صحیحە: ئیمامی بوخاری ( ٦٤٩٧) و ئیمامی مسلم (١٤٣) لە فەرموودەی حذیفة بن یمان ﷺ .

هەڵناگەڕێتەوە، بەپێچەوانەی ئەوەی کە تەنها قورئانی پێیە یان تەنها ئیمانی هەیە - بێ زانست و تێگەیشتن -، جا ئەمە ئەکرێ هەڵبگەڕێتەوە، جا ئەمەش واقعە - ڕاستیە -.

بەڵامەکو زۆربەی ئەوانەی کەدەبینین توشی (الردة) هەڵگەڕانەوە دەبن لە ئاینی ئیسلام ئەوانەن کە قورئانی پیرۆز دەزانن بەبێ زانست و تێگەیشتن و بەبێ بڕوای – پتەو – ، یان ئەوەی ئیمانی هەیە بەبێ زانست و قورئان، بەڵام ئەوەی قورئان و ئیمانی پێکەوە هەڵگرتبێت ئەوا زانستیشی پێ دەبێت، تا ئەمە ئیمان و باوەڕ لە دڵی دا هەڵناگیرێتەوە ... خواش زاناترە.

..... کۆتایی هات

وصلى الله على محمد و على آله وصحبه أجمعين

بلال جلال آل حراو

٩-٨-٢٠١٠ ی زاینی، بەرامبەر

٢٨ ی شەعبانی ١٤٣١ ی کۆچی

کوردستان / کەلار

ئیسلام لە کاتی سەرهەڵدانی دا نامۆ بوو، نەدەناسرا، بەڵام دواتر دەرکەوت و ناسرا ، بەو شێوەیەی یەکەم جاری لێدێتەوە کە نا ناسرێتەوە و پاشان دەردەکەوێت و دەناسرێتەوە.

جا ئەو کەسانەی لەکاتی نامۆیدا دەیناسن وەکو ئەوانەن کەلەکاتی یەکەمدا دەیان ناسی ...... (( شیخ الاسلام ))




چاپخانەی زانا

B

ژمارەی سپاردنی ( 879 ) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.